ناوی کتێب –هونەری جەنگ

ئامادە کردن وشیکردنەوەی-ئەحمەد ناسیف

چاپی یەکەم –دارالکتاب العربی-٢٠١٠

وەرگێڕانی لەعەرەبی یەوە- ڕەشید ئەحمەد سابر

تایپ کردن - وەرگێڕ

دیزاینی بەرگ- هاوتا ڕەشید ئەحمەد

لەسەر ئەرکی بەڕێز مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە لەچاپ دراوە

## پێشکەشە

- بەگیانی پاکی هەمووشەهیدانی کوردستان

-بەهەمووئەفسەرو پێشمەرگەکانی کوردستان

-بەهەموو کوردێك کەهاوکاری پێشمەرگەی کردووە

## سوپاس و پێزانین

١-بوماموستا عادل عمر کە هاوکارم بوو لەڕاست کردنەوەی هەندێ زاراوە ی کوردی

٢-رائد نجم الدین حمە نوری هاوکارم بوو بۆ چاپ کردنی ئەم بەرهەمە

## پێشەكی وەرگێڕی كوردی

وەكووئەفسەرێك هەمیشە هەوڵم داوە پەرە بە تواناكم بدەم لەڕووی بەدەست هێنانی زانیاری سەربازی وستراتیژی ، ئەمەش بۆمن زەحمەت بوو كەلە خولە سەربازیەكان بەدەستی بهێنم ، چونكە بەهۆی بارودۆخی تایبەتی هەرێمی كوردستان كەلە پاش پرۆسەی ئازادیەوە ئێمە بەشداری خولی سەربازیمان كرد كەئەو كات تەمەنم چل ویەك ساڵ بوو . مەرجی خولەكان وكۆلێژی ئەركان منی نەدەگرتەوە . لەو لایەنەوە من نائومێد بووم ، بەڵام كۆڵم نەدا وڕووم لەكتێبە سەربازی وستراتیژیەكان كرد وكتێبی باشم دەست كەوت لەرێگەی ئینتەرنێتەوە كەبە (( pdf )) پەخش كراون لەكتێبخانە ئەلەكترۆنیەكان كەئەم كتیبەی زانای چینی (( سون تزو )) یەكێكە لەو كتێبە نایابانە كەزۆر سەرنجی ڕاكیشام وچەند جارێك خوێندمەوە كەگەیشتمە ئەو باوەڕەی بە پێویستم زانی كەهەموو ئەفسەرەكا نمان بیخوێننەوە و رێنومابێت بۆ هەرهەنگاوێكمان بەرەو سەركەوتن ، چونكە زانیاریەكانی بۆ هەموو سەردەمێك گونجاوە ، چونكە لەكتێبخانە كوردیەكان پرسیارم كردوە دەستم نەكەوتووە هەستام بە چاپ كردنی دانەیەك لەم كتێبە لەگەڵ چەندین كتێبی تردا . چونكە خوێندنەوەو وەرگێڕان بۆتەمەنێكی وەك من زۆر زەحمەتە و توانای چاوەكا نمان لەدەست ئەدات . ڕەنگە لەوەرگێڕانە عەرەبیەكەی ئەم دانەیە جیاوازی هەبێت لەگەڵ وەرگێرانەكانی تر كە پاشتر لەكتێبخانەكان چنگم كەوت . بەڵام من لەكارەكەم بوویوومەوە . گرنگ ئەوەیە لای من ئەم كتێبە بەكوردیەكەی هەبێت ..هەرچەندە ئێستا دنیا لە پیشكەوتنی تەكنەلۆژیای گەورەدایە لەبواری كۆكردنەوەی زانیاری وچەكی پێشكەوتوو بەڵام لەكوتایی جەنگەكان هەر هێزی پیادەیە كەچنگ لەزەوی گیردەكات وجەنگ بەلایەكدا دەخات ، ئەمەجگە لە بوارەكانی تری جەنگ ورامیاری . بۆیە دەستم بەوەرگێڕانی كتێبەكە كرد . هەندێ ئاستەنگم بۆهاتە پێش ، بەتاییەتی زاراوە سەربازیەكان ، كە پەنام بۆ فەرهەنگی عەرەبی وكوردی برد . تائەگەر لەسەداسەد ئاما نجم نە پێكابێت هیچ نەبێت نریكم كردوەتەوە . وەشایانی باس كردنە كەماموستا عادل عومەر لەكۆمەڵەی ڕوناكبیری وكۆمەڵایەتی كەركوك ، لەهەندێ ووشەو زاراوە بۆدڵنیا بوونم بۆكوردی یارمەتی دام . وسودی زۆرم لێ بینیوە .شایانی ڕیزو سوپاس كردنە. من هیچ لەسەر ناوەڕۆكی كتێبەكە ناڵێم . چونكە كتێبەكە خۆی باسی خۆی دەكات ، كەچەندە گرنگە ، بۆ سەرجەم ململانێكانی ژیانی تاك وگروپیك ، تادەگاتە نەتەوەو سوپاكان . هیوادارم توانیبێتم بەم كارە خزمەتێكم بەگەلەكەم كردبێت

عەقید ڕەشید ئەحمەد سابر

رەشید كەركوكی

ئۆكتۆبەری ٢٠٢٠

# هونەری جەنگ

سەیر نی یە کە کتێبی (( هونەری جەنگ )) ، بەیەکێك لەسەد کتێبە گرنگەکانی مێژووی مرۆڤایەتی دابنرێت. ئەم کتێبە لەنـاو ئە نجومەنی سەربازی و، لەنێوان پسپۆرانی زانستی ستراتیژی، ناوبانگی پەیدا کرد کەکتێبی پیرۆزە ، بۆ تویژینەوەی سەربازی .

سیازدەبەشی کتێبەکە ، تەنها گێڕانـەوەی هەندێ ڕوداوی دیاریکراو نی یە . هێندە ڕستە وبڕگـەی ئـاماژەداری پڕ واتـای تەکتیکی گشتی یە..هەندێکی هەڵدەبژێرین ، بـۆ ڕوون کردنەوەی هزری دانای چینی (( سـون ئوتزو ))کەلەگشت کات وشوێنێك بەکەڵك دێت .

یـەکـەم وەرگێڕانی ئەم کتێبە، بۆ زمانی فەڕەنسی ، نزیکەی دووسەد ساڵ دەبێ. کەسەرکردە سەربازیەکان سوودیان لێ بینی لەئۆپەراسیۆنی گەردەلولی بیابان ، ساڵی ١٩٩١ لە پێشتردا ، نا پلیۆت پۆنا پـارت وسەرکردەکانی ئەڵمان سوودیان لێ بینیوە . لێرە ئەوە ڕوون دەبێتەوە ، کەئەم کتێبە ، بەرلـە ٢٥ سەدە دانراوە و، هەتـا ئێستا بەکەڵکی کارپێکردن دێت لەبواری بەڕێوەبردنی ململانێ دا. نـەك ململانێی سەربازی بەتـەنیا ، بەڵکو ململانێ لـەچەند ئاستدا، وەك تـاکە کەسی ،کۆمەڵی و، نەتەوەیی و، نێودەوڵەتیش ، نەك هەرلەبواری سەربازی ،بەڵکو لەبوارەکانی سیاسی وبەڕێوەبردن و وەرزشیش .
کتێبەکەی (( سون ئوتزو )) بەشێوەی شە پۆلاوی دەست پێدەکات و، بەڕونی ئەچێتە سەر کاروبار و، پرەنسیپەکان و، ئامادەکاریە سەرەکیەکان. پاشان دەستی خوێنەر دەگرێت ، کەخەریکە هەست دەکات گـەیشتوەتە شوێنی ئارام،دەستی دەگرێ وداوای لێ دەکات کـــەبیر بکاتەوە لــەوەی کەگرنگە ، وە گرنگترە جارلـــەدوای جار . ئەوەش دوراییی سیاسی و واتاییە وەلەکۆتاییدا دوراییی مرۆڤایەتی . ئالێرەوە سەرنجی (( سون تزو ))دێتە سەر مەرجی یەکێتی نێوان سەرکردەو گەل . کە بینی ئەبێتە هۆی مسۆگەر کردنی ئارامی لەناوەوە، واتە نیشتمان بەزمانی سەردەم . وەتوانای ئامادەباشی سەرجەم توانا مرۆیی ومادی و واتاییەکانی . بەجۆرێك سەرکردایەتی دانای هەلکەوتوو، ئەو سەرکردایەتیە بێت کە پشت دەبەستێ بەیەکگرتنی سەرکردەو گەلەکەی، واتە پەیڕەو کردنی سیاسەتێك کەببێتە هۆی پێکەوە ژیانی گەل وسەرکردەکانی بەدڵسۆزی .
دەستنوسە چینی یەکان وامان بۆ دەرئەخەن کە(( سون ئۆتزوو ئوو ))کەبەکورتکراوەیی ناسراوە بە(( سون تزو ))کەهاونیشتمانی وسەربازێك بوو لەشانشینی (( چی ))لەچینی کۆن . بـــەهۆی بـلاوبـونەوەی شارەزایی یەکەی لـەهونەرەکانی جەنگ سەرکردە سەربازیە گەورەکان ئاماژەیان دابە پاشا (( هولوو )) کــە یارمەتی لێ وەربگرێ لـــەبەرئەوە پاشا داوای لێ کرد پـــوختەی ئـــەزمونەکانی بخاتە دووتوێی کتێبێك ئەوەش ( هونەری جەنگ ) بوو پاشا پێی گووت کتێبەکەت هونەری جەنگم خوێندەوە ئایا ئەتوانم تێزەکانت ، بخەمە ژێر تاقی کردنەوەی سادەوە ؟

وەڵامی بە بەڵێ دایەوە. پێشنیاری کرد تاقی کردنەوە کە لەسەر کەنیزەکانی پاشا بێت . پاشا ڕازی بوو ، نزیکەی ٣٠٠ کەنیزە لەکۆشکی پاشا ئامادەکرا وکردنی بەدوو بەشەوە، بۆسەرهەرکۆمەڵێکیان کەنیزەیەکی خۆشەویستی پاشای دانا وزرێی پی لەبەرکردن وفرمانی پێ کردن کەبەشمشێروخە نجەر لەدەستەکانیان چەکداربن . پاشان گوتی :جیاوازی نێوان پێشەوە

وپاشەوەودەستی  ڕاست وچەپ ئەزانن؟ ژنەکان وەڵامیان دایەوە
:بەڵێ ، پاشان گووتی کەتەپڵ لێئەدەم  وداوا ئەکەم بۆ پێشەوە بڕوانن  دەبێ بۆ پێشەوە بڕوانن    وە  کـەتەپڵەکان لێئەدەم وئەڵێم بۆلای چەپ وەرگەڕێن  وەك فەرمانەکە بکەن هەربەم جۆرەش بە رەولای ڕاست ،وەهەرکە تە پڵم لێداو گووتم بۆدواوە وەرگەڕێ بەئاراستەی دەستی ڕاست بۆدواوە وەرگەڕێن ، ژنەکان بە ڕازی بوون وتێگەیشتن لــەوەی گوتی وەڵامیان دایەوە  . سون تزوو هەستا بەئامادەکاری وفەرمانی دا بۆلای ڕاست وەرگەڕین...بەلاَم ژنەکان دایانە قاقای پێکەنین وجێبەجێیان نەکرد. بۆیە گوتی: ئەگەر وشەکانی فەرمانەکە ڕوون وڕەوان نەبوو ئەوا سەرکردە لۆمە ئەکرێ پاشان بەردەوام بوو گوتی بۆ لای چەپ وەرگەڕێن ، ژنەکان دایانە قاقای پێکەنین وجێبەجێیان نەکرد . گوتی ئەگەر فەرمانەکان ڕوون وڕەوان بووسەربازاکان جێبەجێیان نەکردئەواسەربازەکان هەڵەن  . سێ جار فەرمانەکانی دەرکرد و، بەدەست تە پڵی لێدا هەرکە فەرمانەکان جێبەجێ نەکرا . فەرمانی کرد ، دادوەری سەربازی ئامادەبێت ، لەگۆڕپانەکە لێی پرسی ، سزای یاخی بوون لەفەرمانی سەربازی چی یە؟ وەڵامی دایەوە : سزاکەی مل پەڕاندنە لەبەر ئەوە سون تزو فەرمانیدا بەمل پەڕاندنی هەردووسەرکردەی دوو کۆمەڵەکە لەبەردەم ژنەکان . پاشا چاودێری ڕوداوەکەی ئەکرد وپێی ناشادبوو، ناردی بەدوای سون تزوودا پێی گووت: بڕوام بەتواناکانت هەیە بەمامەڵە کردنت لەگەڵ سەربازەکان . بەلاَم خواردن وخواردنەوەم تامی نەما بەبێ ئەو دووکەنیزەیە. وەلاَمی پەیامەکەی پاشای دایەوە، بەڕاسپاردنتان کەمن سەرکردەی هێزە سەربازیەکانتان بم وهەندێ فەرمان هەیە ناتوانم پێی ڕازی بم کاتێ من لەژێر ئەوڕاسپاردەیەبم . لەبەردەم ژنەکان ئەو دووسەرکردەیە لەسێدارەدران ویەکسەر دووژنی دیکە دانران کەیەك هەنگاو لە پشت ئەودووەوە لە پاشا وەنزیك بوون . مەشق دەستی پێکردەوە ، کەس پێنەکەنی وژنەکان لەمەشق پێشکەوتن ، لەسەرلێدانی تە پڵ بەبێ هیچ کەمتەرخەمیەك
سون تزو هەواڵی نارد بۆ پاشا وگوتی: مەشق بەسەرجەم ژنەکان کراو ئەوان ئامادەی نمایشن وئەتوانن بۆ هەرمەبەستێك پاشا بیەوێت بەکاریان بهێنێت .وەفەرمانیان پێبکە ئەچنە ناو ئاو وئاگر. پاشا وەلاَمی دایەوە: باسەرکردەی سوپاکان بگەڕێتەوە وکۆتایی بەمەشق بهێنێ هیچ حەزم لە نمایشی ژنەکان نیە .لەم کاتەدا سون تزو گوتی: پاشا بەس حەزی لە ووشەی جوانە وناتوانێت ببیگۆڕێت بۆ کردار ،بەلاَم پاشا کردی بەسەرکردەی گشت سوپاکان وناردی تاکو شەڕی شانشینی ( چوف )ی تەنیشتیان بکات وئەویش بەزاندنی وڕێگای خۆی بڕی بەرەو ( یەنگ )ی پایتەخت وپاشان بەرەوباکورکەترسی خستە ناو شانشینی ( چی ) و ( چن ) دەوسەرکەوتن لەدوای سەرکەوتن ، تاکو ناوبانگی بلاَوبووەوە و، شانشینەکە فراوان بووەوە. دوای سەرکەوتنی سون تزو بەسوپایەك کە٣٠ هەزار سەربازی هەبوو ،بەهۆی ئەوەی دوژمن تۆخمی (ڕێکخستن و بەڕێوەبردن ) ی نەبوو.

خوێنەری بەڕێز

ئەگەر بێینەوە لای کتێبەکە ( هونەری جەنگ ) کەسەرکردایەتی هێزەکانی ئەمریکا جەختی کردەوە کە دەبێ گشت سەربازێك ئەم کتێبەی پێ بێت کەدەچێت بۆ شەڕی ڕزگارکردنی کوەیت تاکو بیخوێنێتەوە . وە کۆمپینیاکانی ژاپۆنی ڕاهاتوون ،ئەو ئامۆژگاریانەی کەتێیدایە وەربگرن. تاکو جێبەجێی بکەن .ئەتوانرێت ئەوەی لەم کتێبەدایە، لەجیهانی ئابوری وبازرگانی

وسیاسی ووەرزشی جێبەجیٚ بکرێت . تێڕوانینەکانی تەنها بۆ سەرکەوتن چڕ نەکردوەتەوە .بەڵکو بۆ خۆلادان لەشکست وکەمکردنەوەی زیان ،بۆ ئاستێکی باش بە پێی توانا . هەروەها ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کەچۆن سەرکەوتن بەدەست دێت بەخۆلادان لەکوشتار ئەگەر کرا

ئەحمەد ناسیف

وەرزی یەکەم

١

(( هونەری جەنگ )) ونوسەر سون تزو

ڕێپیشاندەری سەرکردەکان لەگشت سەردەمێك

کتێبی ( بنج فا ) یان هونەری جەنگ ( Art of war )ی سون تزو Sun tzu بەیەکێك لەگرنگترین وبەدەگمەنترین دەستنووس دادەنرێت ، لەمێژووی جیهاندا . وەیەك لەبەناوبانگترین کتێبی چینی یە. پڕبایەخی ئەم کتێبە سەرەڕای ئەوەی کە پێش زاین نوسراوە ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زۆربەی ئەوەی تێیدا هاتوە لەبیروباوەڕ ، هەتاکوو ئەمڕۆش بەکەڵکە بۆ جێبەجێ کردن . هەرچەندە زیاتر لەدوو هەزار ساڵ تێپەڕیوە بەسەر نوسینەوەی .ئەمەش کردوویەتی بەکتێبێکی ستراتیژی پڕ بایەخی بێ ڕکابەر . ئەو هزر و پرەنسیپانەی کەتێیدا هاتوە ئەخوێندرێتەوەو سودی لێ دەبینرێت..نەك هەرلە بواری جەنگ دا بەڵکو لەبوارەکانی ئابوری وڕامیاری وکۆمەلایەتی وبازرگانی وتەنانەت لەبواری وەرزشیشدا،

نوسەری کتێبەکە( سون تزو ) سەرکردەی بالآی سوپای شانشینی – وو –کتێبەکەی تەرخان کرد بۆ سەرکردە سەربازیەکانی سەردەمی خۆی . کە ئامۆژگاری و ڕێنوێنیەکانی هەموان لێی تێگەیشتن هەتاکو ئەمڕۆ،هەرلەجەنگاوەرانی ساموڕایی توندوتیژی ژاپۆنی هەتادەگاتە پێشەوای هەڵسانەوەی چین ( ماو تسی تۆنگ ) لەکۆتاییدا تادەگاتە خاوەن کاری شارەزا لەئێستادا،

لەکاتی خۆیدا بۆ ئاسانکاری لەنوسینەوەی نوسینەکانی سون تزو بەشێوەی ڕستەی کورت وکورتکراوە دا هات کەوەرگێڕەکانی ماندوو کرد لەهەڵبژاردنی ووشەی ورد و خوێنەرانی سەرسام کرد بۆ گونجاوی لەجێبەجێ کردنیدا لەگشت کات وشوێنێك. هونەری جەنگ تەنها چاونابڕێتە سەرکەوتن وبەس ، بەڵکو بۆ شکست نەهێنان وکەمکردنەوە وخۆلادان لەزیان ، بەڕادەیەکی زۆر، وەشیکاری دەکات کەچۆن بەبێ شەڕکردن سەرکەوتن بەدەست دێ ئەگەر بتوانرێ.

وەڕەنگە ناوبانگی ئەم کتێبە، بگەڕێتەوە بۆئەوەی کەدەتوانین لەبواری بازرگانی وڕامیاری و وەرزش جێبەجێی بکەین. تەنانەت لەگشت بوارەکان ،کتێبەکە بریتی یە لە کۆمەڵێ پرەنسیپی سەربازیی چینی ، کەبەرلە ۲۳۰۰ ساڵ نوسراوەتەوە کەفەیلەسوفی بلیمەتی چینی ( سون تزو ) دایناوە ، بۆ مسۆگرکردنی سەرکەوتنی سەربازی بەکەمترین تێچوو وخێراترین ڕێگا. هەر سەرەتایەك لەدێڕێك زیاتر نیە ، یان دوو دێڕ ڕیزکراوە لە وەرزیکدا . کتێبەکە شەش هەزار ڕستە وبڕگە دەگرێتەوە لە۱۳ دەروازە( وتار ) کە هزرە سەربازیەکانی سون تزو بەرجەستە ئەکات .لەدوای ئەمە پێك دێت لەشیکاروگوزارشتی سەرکردە سەربازیەکانی چینی ، کەلەدوای سون تزوەوە هاتوون. کتێبی( هونەری جەنگ ) ناونرا بەیەکەم کتێبی سەربازی کۆن لەجیهاندا . وەکتێبی پیرۆز بۆ توێژینەوەی سەربازی ، هزرە تێزیەکان وهزرە فەلسەفیەکانی کتێبەکە، بەکارهێنرا لەبوارەکانی سەربازی و ڕامیاری و، ئابوری وهی تر . بەشێوەیەکی گشتی. بواری ئەم کتێبە ، کورت نەکرایەوە تەنها بۆ بواری سەربازی و جەنگی .

(( چینگ بینگ ))ی نوسەر کتێبێکی دانا بەناونیشانی (( هونەری جەنگی سون تز و کارە کارگێڕیەکان. ))هەروەها ( چی جوین ) کتێبێکی نوسی بەناوی (( هونەری جەنگی سون تزو و بەڕێوەبردنی کارە بازرگانیەکان ))زۆر کتێبی دیکەش هەن کەلەم کتێبی هونەری جەنگە هەڵهێنجراوە .کەزیاتر لە۱۰۰۰ کتێب لەشیکاری کتێبی هونەری جەنگ بەتەنهالەچین نوسراوە . لەرووی سەربازیەوە سەرکردەی بەریتانی مارشاڵ مۆنتگمەری دەڵێ:کەزۆر گرنگە کتێبی هونەری جەنگ بخرێتە لیستی بابەتەکانی

خوێندن لەکۆلێژەسەربازیەکان لەگشت جیهاندا ، سەرۆکی پێشووی چین( ماوتسی تۆنگ ) ئاماژەی دا کەکتێبی هونەری جەنگ ، زۆر یارمەتی دەری بووە لەجەنگی دژی ژاپۆن ، بەلاّم لەشەڕی کەنداو هەموو سەربازێك دانەیەکی لەکتێبی هونەری جەنگی پێدرا . لەگەل کاسێتێك کەئەم کتێبە شی دەکاتەوە.

یەکەم چونەدەرەوەی کتێبی هونەری جەنگ ، لەزێدی خۆی بۆ ژاپۆن بووە . کەسێ کەس لەگەورەکانی سامورای ، پێداگرییان کردوە بۆخوێندنەوە وجێبەجی کردنی . بۆیەکخستنی ژاپۆن لەژێر یەك ئالآدا. پاشان لەسالّی ١٧٧٢ گۆڕدرایە سەرزمانی فەرەنسی . کەمێك دواتر گۆڕدرایەسەر زمانی ئینگلیزی وئەلّمانی. لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی زۆر ناوبانگی پەیدا کرد. کەزۆرێك لەشارەزایانی سەربازی جەختیان لەوە دەکردەوە ، کەدەکرا ڕێگا لەزۆریك لەو کوشتارانە بگیرێت کەڕویاندا ، ئەگەر لەو کاتەدا لەچەشنی ئەم کتێبە هەبوایە لەلای سەرکردە سەربازیەکان و پلان دانەران وبڕیاردەران.
دەقی ئینگلیزی وەرگێردراوی باوەڕ پێکراو(( د – لیۆنیل جیلز ))ە کەلەچینیەوە وەری گێڕاوە کاتێ لەچین بۆبەرژەوەندی مۆزەخانەی بەریتانی کاری کردوە وە لەسالّی ١٩١٠ بلاّوی کردوەتەوە . سەرەڕای کۆنی وەرگێڕانەکە سەرجەم وەرگێڕانە نوێیەکان پشتیان بەستووە بەم وەرگێڕانە، وەك بنچینەیەك لێوەی دەست پێ ئەکرێ ، ڕەنگە ئەمەش بەهۆی شارەزایی لیۆنیلەوە بێت لەزمانی چینی و حەزەکانی لەهەندێ لقەکانی زانیاری سەربازی . سەرەتاکانی سون تزو زۆر بەسودە لەجیهانی بازرگانی ومامەلّەی کارگێڕی ولەگفت وگۆی ڕۆژانەمان لەگەلّ یەکتریدا :-

– ئەو تەکتیکە دووبارە مەکەرەوە، کە پێشتر پێت بردوەتەوە . هی تر دابهێنە ، یان ڕێکی بخەرەوە بەڕێگایەك کە پێشبینی نەکرێت.

- بە پێی ئاستی گونجاوی دۆخەکە پێویستە مرۆڤ پلانەکانی هەموار بکاتەوە.

- لەیەك کاتدا چەند بەرەیەك لەڕووی خۆتدا مەکەرەوە . هاوپەیمانی لەگەلّ دوژمنێك بکە تالەوی تر تەواو دەبی .

- هێشتنەوەی سیخوڕێك لەناوەوە هاوتای سوپایەکە بەتەواوی.

- باشترین سیخوڕ ئەوەیە کەڕەگەزنامەی دوژمنی هەیە ،بەلاّم باوەڕی بەئامانجەکانت هەیە .

- کوشتار وسەرکەوتن لەگشت شەڕێکدا ،لوتکەی لێاتووی نیە . بالاّ دەستی گەورە شکاندنی بەرگری دوژمنە بەبێ کوشتار.

- ڕەنگە ڕێگای بەزاندنی دوژمنەکەت بزانی ، بێ ئەوەی بتوانی بە پێویست ئەوە بکەی.

- گرتنی دۆخی بەرگری ئاماژەیە بۆکەمی هێز. بەلاّم دۆخی هێرش پێویستس بەهێزی زیاتر هەیە.

- جەنگاوەری ئازا، تۆقێنەر ئەبێ لەهێرش کردندا و، لەسەرخۆیە لەبڕیاردانەکانی .

-بەوردی بەراوردی سوپای دوژمنەکەت بکە بەسوپاکەی خۆت، تابوەستیت لەسەر خالّە هەرەبەهێز و ئەوەی کە لاوازە.

- ئەگەر ئێمە (( بۆ چارەسەری کێشەکە نمان ))ئامادەین هەر دەرفەتێك بۆمان دەلوێ بیقۆزینەوە ، ئەوە دەتوانین خۆمان لە تەنگژەکەمان دەرباز بکەین .

- ولآتی بە پیت داگیر بکە لە پێناوی دابین کردنی خۆراك بۆ سوپاکەت .

- کاری سەرکردە ئەوەیە کەبەئارامی بمێنێتەوە ، بۆ ئەوەی نهێنێتی دابین بکات ، وەدەبێ ڕاست وداد پەروەر بێت بۆئەوەی جێگیری سیستەمی گشتی دابین بکات.

- فەرمانڕەوای هۆشیار پلانەکانی پێشتر دادەنێ،وەسەرکردەی سەرکەوتووئاگای لەسەرچاوەکانی وسەربازەکانی دەبێت (( لەڕێگای پاداشت وسزاو خەلآتەوە )).

- ئەم کەرەستەو هۆکارانە دەمانبات بەرەو سەرکەوتن، پێش کاتی بەکارهێنانیان ئاشکرایان مەکە.

سون ئوتزو – وشەی ئوتزو واتا مامۆستا ، یان ئەو پیاوەی گەیشتوەتە ئاستی بالآ لەزانست وفەلسەفە(١) . لەساڵی ٥٥١ پێش زایین لەدایك بووە لە( لوئان ) ، کە کەوتوەتە شانشینی ( چی ). سون لەخێزانێکی سەربازی ڕەسەنە ، باوکی و، باپیری و، باپیرە گەورەی ، بەگرنگترین سەرکردەی سەربازی پێشەوا دادەنرێن ، لەگێڕان وسەرکردایەتیکردنی جەنگ، ئەم بارودۆخانە هۆکاربوون تاکو باشترین زانستی سەربازی وەربگرێت ، کەوای کرد ئامادەی بکات تاکوو ببێتە باشترین پسپۆڕی چینی ، لەجەنگ وستراتیژی. تاکوساڵی ٤٩٦ پێش زاین ژیا ناوبانگی بلآوبووەوە بەهۆی بلیمەتیەسەرباز یەکەی کە پێی بەناو بانگ بوو . تزو هاوچەرخی کۆتاییەکانی سەردەمی بەهاروپایزبوو، کەکۆمەڵگای چینی گۆڕانکاری بەخۆیەوە بینی لەکۆمەڵگای کۆیلایەتی یەوە بۆ دەرەبەگایەتی، کەجەنگ زۆر بوو لە نێوان ١٣٠ شانشینی بچوك ،کەلەکۆتاییدا بوەهۆی دەرکەوتنی پێنج شانشینی بەهێز ، کەململانێ لەنێوانیاندا بەرپابوو ،لەسەر دەسەلآت وحوکمڕانی. ئەم جەنگە درێژخایەنانەدوور لە ئوتزو نەبوو کەشارەزایی جەنگی زۆری پەیدا کرد، کەبەهرەکانی پوختە وزانیاریەکانی زۆرتر بوو. پاش ئەم گرژیانە ، تزوولەشارەکەی خۆی کۆچی کرد بۆشانشینی- وو –لەڕۆژهەلآتی چین .(بۆ ڕۆژئاوای شاری شەنگەهای ئەمڕۆ ) لەوێ وازی لەجیهان هێنا ، خۆی تەرخان کرد بۆ توێژینەوەی زانستی سەربازی ، پوختەی شەڕە جەنگییەکان کە نیازی بوو دەست بە یەکەم نوسینی دانراوەکەی( هونەری جەنگ ) بکات. ناو بانگی نوسیەنەکانی گەیشتە فەرمانڕەوای شانشینی (وو) . لـــــەو ماوەیەدا پاشـا دەیویست هێرش بکاتە سەر شـــــانشینی ( چی )وداگیری بکات ، زاڵ بێت بەسەریدا. یەك لەوەزیرەکانی ، پێشنیاری کرد، سوود لە( سون )وشارەزاییە سەربازیەکانی ببینێ. ( سون ) سیازدە وتاری سەبارەت بە شەڕ وستراتیژی سەربازی نوسی ، وەزیریش پێشکەشی پاشای کرد . ئەویش پاش ئەوەی خوێندیەوە، ڕێز وستایشی زۆری کرد . داوای لێکرد سون تزو، بە سەرکردەی گشتی سوپای شانشینی (چی) دابنرێت . پاشتر نیازی کرد ، کە مەشق بەسەربازەکان بکات و ،شارەزاییان پوخت بکات و، دەوروبەری شانشینەکەی فراوان بکات . وەیارمەتی دەربوو ، بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن لەدوای سەرکەوتن ، وە فراوان کردنی قەلەمڕەوی شانشینەکە، وەئەم وتارانە یەکێکە

لەهۆكارە سەرەكیەكانی سەركەوتنی شانشینی ( وو ) ، بەسەر شانشینی ( چی ) دا . ئەم وتارانەیە كەئەمڕۆ ناسراوە بەكتێبی هونەری جەنگ . ئەو كتێبەی هەتا ئێستا گونجاوە بۆ جێبەجی كردن .

كتێبی –هونەری جەنگ –ئامۆژگاری ورێنوێنی دەگرێتەوە ، بۆ پادشا وسەركردە سەربازیەكان ، لەبواری ستراتیژی سەربازی و، تەكتیكی جەنگی . زۆر جۆری جیاوازی مانۆڕی جەنگی باس دەكات و ، مەودای كاریگەری گۆڕەپانی جەنگ ، وە سروشتەكەی بۆ ئە نجامەكانی ئەو جەنگە. وەهەروەها لەكتێبەكەدا جەخت دەكاتەوە لەمەودای گرنگی بەدەست هێنانی زانیاری ڕاست و ورد، لەسەر هێزەكانی دوژمن ، بارودۆخیان ، چۆنیەتی بلاَوبونەوەیان ، وەجموجۆڵیان. ئەمەش لەیەك لە وتارە بەناوبانگەكانیدا كورت كراوەتەوە ، كەكتێبەكەی بەهادار كردوە . ئەویش ئەوەیە ئەگەر دوژمنت ناسی وخۆت ناسی، ئەوا دەتوانی سەد جەنگ بگێڕی وتۆ لەمەترسی بەزاندن پارێزراویت .

---

١- ڕەنگە بتوانین وشەی پیرلەكوردیدا بەكار بهێنین وەك –پیری موغان، پیری شالیار- وەرگێڕی كوردی

كتیبەكە لەلایەكی دیكەوە ، جەخت دەكاتەوە ، كەمەحاڵە پێشتر چارەنوسی جەنگەكە مەزەندەدە بكەی . وە پێشبینی لەڕوداوەكانی بكەیت ، یان چی ناكاویەك تێییدا دەرئەكەوێت .. ئەمەش وادەكات كە پێویستەسەركردە پشتی بە ستراتیژو پلانی جەنگی نەرم ببەستێ .

پاشا ن كتێبەكە، جەخت دەكاتەوە لەقوڵی پەیوەندی نێوان ڕەهەندی سیاسی وسیاسەتی سەربازی ،ئەم هزرەش زۆر باش پەسەند كرا. كاریگەری زۆری هەبوو لەسەر هزری پسپۆرانی نوێگەرای ستراتیژی ڕۆژئاوا، .هەروەها لەهزری ژمارەیەك لەسەركردە كۆمۆنیستە چینیەكان، لەوانە ( ماوتسی تۆنگ ) .

( هونەری جەنگ ) ، كۆمەڵێ سەرەتای سەربازی چینی یە . كەلە پێش ٢٣٠٠ ساڵ نوسراوە ، كە فەیلەسوفی چینی –سون تزو- دایناوەبۆ مسۆگەركردنی سەركەوتنی سەربازی بەكەمترین تێچو ، وە بەخێراترین ڕێگا. هیچ سەرەتایەك لەدێڕێك یان دوو دێڕ زیاتر نیە ، كەرێكخراوە لە چەند وەرزێك، كەبە(( ئامادەكردنی پلان ))دەست پێدەكات ، وەبە(( سەربازكردنی سیخوڕەكان )) ، كۆتایی دێت . سەیر ئەوەیە كە-سون- خۆی دژی جەنگ بوو . ( وەك ئامرازێك بۆ چارەسەری كێشەكان ) بەلاَم ڕاستەوایی بوو، كەوای دانا جەنگ هەردەبێت ومەحاڵە ڕێگری بكرێ ، لەبەر ئەم هۆیە بڕیاری دا كۆمەڵێ سەرەتا بنوسێتەوە بۆ مسۆگەركردنی سەركەوتن، بەكەمترین ژمارەی زیانی مرۆیی (( بەڵكو بەبێ چوون بۆ زەوی شەڕ )).

كتێبەكە هەتا ئەمڕۆ ، بەبناغەی ستراتیژی سەربازی دائەنرێت لەچین، وەلەساڵی ١٩٧٢ زانایانی شوێنەوار پێنج وەرزی نادیاریان دۆزیەوە وخرایە سەر ئەو دانەیەی كەهەیە. وەسەرەتاكانی سون هەتاكو ئەمڕۆ بەسودە تەنانەت بۆ جیهانی

بازرگانی و، مامەڵەی کارگێڕیش، بەڵکو لە وتو وێژی ڕۆژانەمان لەگەڵ یەکتری. هەرچەندە تەکنەلۆژیای سەربازی هەندێ لەو سەرەتایانەی تێپەڕاند، بەلام هێشتا زۆرینەی وەك بناغە تاکو ئەمڕۆ ماوەتەوە ، ئەمەش چەند نمونەیەکی:

- جەنگێك ناتوانی بیبەیتەوە، هەوڵ بدە خۆتی لێ لابدەی و، پەنا ببە بەر گفت گۆ تائەتوانی .

- جەنگ بەهێز نابەیتەوە ، بەڵکو بەخەڵەتاندن و، پەلەنەکردن.

- هێرش بکە سەر دوژمنت ، کاتێ ئاشتی پیشان ئەدەی ، وە دور کەوە لێی ، کاتێ پێشبینی هێرشت لێ دەکات .

- ئەو تەکتیکە دوبارە مەکەرەوە کە پێشتر پێت بردوەتەوە ،هی تر دابهێنە، یان گۆڕنکاری تێدا بکە ، بەڕێگایەکی پێشبینی نەکراو .

- کاتێ دوژمن لەبەر دەستتە وبەهێمنی ماوەتەوە، ئەوا داوێکت بۆ دەنێتەوە .

- جەنگی نمونەیی جەنگی خێرایە ، جەنگی درێژ خایان ، خوێن لێچونی سەرکەوتوەکەیە هەروەك دۆڕاوەکە.

- کەبەرەنگاری دوژمنێکی بەهێز دەبیتەوە، مەجوڵێ ، تاکو دەرفەتێکت دەست دەکەوێ ، وە مەجەنگێ تاکو لەقاوغی خۆی دەرئەچێ وهێرشت بۆدەکات .

- ئامادەبە ، تاهەڵەکانی دوژمن ئەقۆزیتەوە ، چونکە بێ ئەوە سەرکەوتن نایاتەدی.

- هێزو تواناکانت بەنهێنی بهێڵەرەوە ، هەتاکوو داخراوبیت دوژمن لێت دەترسێت و، تواناکانت بەگەورە دائەنێ.

- خۆت توشی بەزینێکی مەزندە کراو دەکەیت، ئەگەر( خۆت )کات وشوێنی جەنگەکە دیاری نەکەیت.

- لەدۆخی کەشی توندجەنگ مەکە کەدوژمن پێی ئاشنایە و، هێزەکەت پێی ئاشنا نیە.

- زەوی بەشێکە لەسوپا، ئەو تواناکەی بەرز ونزم دەکات.

- کەزەویت هەڵبژارد ، بگەڕێ بەدوای بەرزترین شوێن کەزۆر ڕەقە.

- کەدەستت ناکەوێت، زەویەکی تەخت هەڵبژێرە وپشتی خۆت بە سەنگەر بپارێزە.

- لە پێش دوژمن دەست بگرە بەسەر ڕێڕەوە تەنگەبەرەکان و، خاڵە گرنگەکان. هەرکە پێی گەیشتی وای دابنێ داگیری دەکات .

- دەست پێشخەر بە لەکوشتاری دوژمن ، کاتی لەڕوبار دەپەڕێتەوە ، کەئەو لەو بەرەوە بوو تۆ مە پەڕێرەوە.

- هەرچەندە هێڵەکانی خۆراك هێنانت درێژ بێت ، لاوازیت زۆر تر ئەبێ . چونکە لەوانەیە دوژمن پێچ بکاتەوە بەدەورتدا.

ـ لەیەك كاتدا چەند بەرەیەكی شەڕ بەسەر خۆتدا مەكەرەوە ، هاوپەیمان بە لەگەڵ یەك لەدوژمنەكانت، تالەوی تر ئەبیتەوە.

ـ كاتێ دوژمنت گەمارۆدا، دەرچەیەكی بۆ هەلآتن بۆ بهێڵەوە ، فشاركردن بەتوندی وای لێدەكات شێرانە شەڕ بكات.

ـ پاراستنی سیخوڕێك لەناوەوە، بەرامبەر سوپایەكە بەتەواوی.

ـ باشترین سیخوڕیش ئەوەیە كەڕەگەزنامەی دوژمنی هەڵگرتبێت ، بەلآم بڕوای بەئاما نجەكانت هەبێ.

ـ لەكۆتاییدا مسۆگەر كردنی سەركەوتنی كۆتایی، ڕەنگە پێویستی بە كردنە قوربانی باشترین سیخوڕیش بێت.

٢

سون تزو

هونەری جەنگ لەسەر شێوازی چینی

هونەری جەنگ ، كلاسیكێكی سیاسی چینی یە و، دەرئە نجامی ماوەیەكی دوورودرێــژی بارگرژی گەورەیە لەمێژووی چین ، وەباشترین شتی ناو ئەم كلتورە ئەگەڕێتەوە بۆ بابەتەكانی،واتە شیكاری سروشتی جەنگ، .وە پێشكەش كردنی وێنای چۆنیەتی دابین كردنی سەركەوتن. بە پێچەوانەی كتێبەكانی بورجی عاجی و، بیركردنەوە تیۆریەكانی ستراتیژی ، ئەم كتێبە بەڕاست دائەنرێ و وەلآم دانەوەی كرداری یەو، پەرچەكرداری ئەو بارودۆخەیە كەتێیدا نوسراوە، وەكاریگەری زۆری هەبوو لەناوخۆ و، دەرەوەی چین.

هزری چینی ( هەروەك لەكتێبەكەدا هاتووە وبەبەردەوامی ) ڕەگ وریشەی قوڵی هەیە لەڕاستەقینەدا بەفراوانترین مانای ئەم وشەیە، هەروەكو زانراوە لەكارەكانی هزری گەورەی چینی، باسی ستایشی ئەم كتێبە دەكات كەوەلآمدەرەوەی گشتگیرە، بۆ تەنگژەی مرۆڤایەتی. تەنانەت لەناخی ڕاسپاردە سەربازیەكانی نوسەرەكەی سون تزو دا، گیانی چینی بەشێوەی ( تاوی )٢ هیچ دوور نیە لەناواخنی كتێبەكە.

ئەم فەلسەفەیە كەخۆی ئاما نجی گۆڕینی كەسایەتی یە لەڕوبەڕوبونەوەی واقعی ڕەها، ئەكرێ وئەتوانێ زانیاری دابین بكات لەگشت لایەنەكانی ژیان . سەرەتا لەبۆنە ئاینیەكانی رەهبانەكان ، تا دەگاتە هونەرە سەربازیەكان . بێ ئاگایش لەمە واتا لەدەستدانی ئاستی قوڵی مانای ئەم جۆرە دانراوانەیە.

بیروباوەڕێکی ئاینی وفەلسەفەی چینیە . دامەزرێنەرەکەی –لاوتزە- جەخت دەکاتەوە لەژیان بەدلسۆزی لەکەڵ –تاو –هزری سەرەکی زۆربەی فەلسەفە چینیەکان ، کەمانای ئەوپرەنسیپەیە کە ناواخن وکرۆکی هەموو شتێکە لەژیان . تاوی جیاوازە لەکۆنفۆشیۆسی بەوەی کەتوند نیە لەسەر بۆنەوشك وبەستوەکان و سیستەمی کۆمەلایەتی . بەلام وەك ئەو وایە لەتەواوی پابەندی ورەفتارەکان کە کامڵ بوون دێنێتەدی لەرێگای پەیوەست بونی تاك بەئاوازەکانی گەردوون کە هێلکاری بۆنەکراوە وپێیدەلێن ڕێگا- داو- بەشێوەیەکی گشتی جەخت لە –وو وی- دەکاتەوە کە مانای کارکردن دەدات بەبێ نیاز ومەبەست وە سروشت وسادەیی وهەرلەخۆوە وسەرباری سێ گە نجینە –بەزەیی ودەست پێوەگرتن ولەخۆبوردەیی بۆزانیاری زیاتر بڕوانە ویکیپیدیا – وەرگێڕی کوردی

هەروەك چۆن دۆخەکە لەگەڵ کاری هزری گەورەی چینی ئاوایە ، ئەوا مێژووی نوسینی کتێبی ( هونەری جەنگ ) زۆر دلنیا نیە .مێژووی ژیانی کەسێتی نوسەر ( سون تزو ) لەچەندین کتێبی بەنرخی مێژووی چینی دا هەیە ، کتێبی تۆمارە مێژووییەکانی نوسەر( سیما کیان ) کەلەسەدەی یەکەمی پێش زایین نوسراوە ، باسی سون دەکات کەیەکێکە لەهاونیشتمانیانی ( کی )کەلەخزمەت پاشا( ویو ) کاری کردوە سەرسام بووە بە شارەزاییە سەربازیەکانی .

ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ، کەواتە سون نزیکەی ٥٠٠ سال پێش زایین ژیاوە. لەگەڵ کۆتایی ماوەی مێژوویی ناسراو بەقۆناغی بەهارو پایز لەمێژووی چینی دا. بەلاٖم هۆیەکی پەسەند هەیە کەوای دادەنێت ئەم مێژووە ورد ودروست نیە ، بووە جێگای مشت ومڕ لەچین ، بەلای کەمەوە لەسەدەی یازدە. هۆیەکانی ئەم گومانە بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ نەبونی ئاماژەکان بۆ کەسایەتی سون ، لەکارەکانی ئەم قۆناغە گەورەیە، چونکە گەواهیەکانی پەیوەست بەوجەنگانەی لەکتێبەکەدا هاتووە ، بارودۆخی سەردەمی کۆن نانوێنێ.

هەرکەسێك ئەم کتێبەی نوسیوە، گریمانەی سوپای گەورەو، ئەفسەرانی شارەزای کردوە ، کەئەو کاروبارانەش لەقۆناغی بەهاروپایزدا نەبووە ، لەو سەردەمەدا قەبارەی جەنگ بچوك و ، سەرەتایی و، ئاژاوەیی و، شێوەیەکی کورتی پاڵەوانێتی تاکە کەسی بووە . کەدەسەلاٗتداران نوقم ئەبن تیایدا، نەك ئەم پیشە پسپۆریە ڕاستیەی کەئەم دەقە وێنای دەکات .

ئێستا بڕوا وایە، بەلای کەمەوە ئەم دەقە لەماوەی قۆناغی دەوڵەتانی شەڕکەری مێژووی چینی دانراوە ، کە درێژ ئەبێتەوە لەنێوان٤٠٣ بۆ ٣٢٨ پێش زاینی ، کە پە نجە مۆری هزری تاکەکەسیێکی دیاری پێوەیە، ئیشی ئەم تاکەکەسە هەرچیەك بوویێت ، ئاشکرایە کەخاوەنی ئەزمونێکی ڕاستەوخۆی جەنگ بووە .

ناونانی قۆناغی دەوڵەتانی شەڕکەر، ناونانێکی وردە ، کەلەماوەی دووسەدەو چارەکێك بەردەوام بوو . چین وەك دەوڵەتێکی یەکگرتوو دەرنەکەوتووبوو. کەلەگەڵ کۆتایی قۆناغی بەهارو پایز ، کەبەشەڕە گرژەکان جیادەکرێتەوە، کەلەکۆتاییدا چین

بووە حەوت دەوڵەتی بەهێز و ، پازدە دەوڵەتی کەم هێز. هەروەك چۆن ناونانی قۆناغی دەوڵەتانی شەڕکەر ئاماژەی ئەدا، ئەمە یەکێکە لەو قۆناغانەی کەزۆرترین دەوڵەتانی بەهێز کێبڕکێیان دەکرد، بۆ هەژموونی خۆیان کەدراوسێ بچوکەکەی قووت بدات . هەرکاتێ پێویستی کرد .لەبەر ئەمە مێژووی قۆناغەکە مێژووی جەنگی بەردەوامی هاوپەیمان وهاوپەیمانی دژبووە . پەیماننامە ئەبەسترێ و، پەیماننامە ئەشکێنرێ ، بۆیە هیچ کت وپڕی نیە ، کەسروشتی جەنگ بگۆڕێت، لەگەڵ کۆتایی قۆناغەکە، هەروەك ئاشکرا بوو کەئارامی سیاسی بەئاسانی نایاتەدی، بۆیە جەنگ وەستا لەوەی کەتەنها پاڵەوانێتی بێت ،بووە دۆزێکی ڕاستەقینە .

. قەبارەی سوپاکان گەشەی کرد و، هەڵمەتەکان درێژەیان کێشا ، وەبایەخ بە پاراستنی ئابوری درا بۆ پشتیوانی ململانێی چەکداری . جێگای سەرسامی نی یە، کەلێرەوە دەستەیەك لەئەفسەری شارەزا دەرکەوتن کەژیانیان تەرخان کرد بۆ بەڕێوەبردنی جەنگی سەرکەوتوو. هەروەکو تێبینی یەکەمی دەست پێکردنی کتێبەکە دەڵێ : جەنگ بوەتە ئەرکێکی پڕ بایەخی دەوڵەت و، کلیلی مانەوە ، یان وێران بوون. وەمەرجێکە بۆ مانەوە کەدەوڵەت خاوەنی سوپایەکی کاریگەر، بەسەرکردایەتیەکی هەڵکەوتوو بێت . کەڕەنگە نوسەری کتێبەکە، خۆی لەم چینی جەنگاوەرە شارەزا یەوە هاتبێت، کەئەو لەکتێبەکەیدا بەرهەمی ئەزمونی خۆی ، لەسیازدە وەرزی بچوك کورت دەکاتەوە و، بۆمان دەگێڕێتەوە کەچۆن جەنگ ببەینەوە.

کلیلی یەکەمی سەرکەوتن ، خەڵەتاندنی دوژمنە. گشت جەنگێك لەسەر بناغەی خەڵەتاندن بەڕێوەدەچێت لەبەر ئەوە کاتێ توانای هێرشت هەیە ،بە کەم توانا خۆت دەرخە. کەهێزەکانت دەجوڵێنی ، واخۆت دەرخە کەهیچ ناکەیت . وەرێگری کردن لەوەی کەدوژمن ، کە ڕەسەنی مەبەستەکانمان تاقی بکاتەوە، پایەی یەکەمی بایەخەکان دەگرێتەوە . وە بەخەڵەتاندنی دوژمن ، نازانێ کەی هێرشی دەکرێتە سەر ؟ وەیان کەی بەرگری بکات؟ وەئایا پێویستە لەسەری هێرش بکات، یان بەرگری بکات ؟ بە مجۆرە لەگشت بەرەکانی شەڕ ئامادەباشی دەکات و، هێزی لەم جۆرەش پەرش وبلاو و، لاواز دەبێت. لەگشت لایەکەوە ، بەدڵنیاییەوە تێك دەشکێت .

ئەگەرلە بنەڕەتدا دەبێت مرۆڤ جموجوڵەکانی بەنهێنی بپارێزێت ، ئەوا بەهەمان شێوە ژیاریە، کەزانیاری زۆری هەبێ لەسەر پلانەکانی دوژمن .

هەواڵگری باش ، کاری دوهەمی بنەڕەتی یە لەجەنگ دا. ئەمە لە پشتی قسەکەی تزووەوە ئەوەستێ، کە تۆڕی هەواڵگری فراوان ، جێگای هەڵبژاردەنیە، بەڵکو پێویستی یەکی بنچینەییە. کەبردنەوەی جەنگ ئەنجامی زانیاری پێشینەیە ، واتە هەواڵگری. ئەم زانیاریەش لەڕێگای ڕاوێژکردن بەبورجەکان و، گیانەکانەوە نایات، یان لەسەر ڕوداوەکانی ڕابوردوو بنیات نانرێت. بەڵکو دەبێ لەکەسانێکەوە دەست بکەوێت، کەبارودۆخی دوژمن ئەزانن وسوپاش پشت ئەبەستێ بەو زانیاریانەی کە سیخوڕەکان کۆی دەکەنەوە. لە پێناو هەرجوڵەیەك لەجوڵەکانی. هەروەك تزو دەڵێ : جێگایەك نیە سیخوڕی تێدا نەبێ . وەتۆڕێکی فراوان لەسیخوڕەکان کەموچەیەکی بەرچاوی وەردەگرن، وەبەرهێنانێکی بەنرخی گەورەیە سەبارەت بەدەوڵەت . وە

سون تزو لەزۆر بۆنەو جێگادا جەخت دەکاتەوە کەزانین وهەوالگری بایەخدارێکی ژیاری یە لەجەنگ دا : دوژمن بناسەو خۆت بناسە، لەسەد شەڕ نابەزێی .

سەرکردە کەسی بەرپرسە لەستراتیژ، لێرەوە ، لەخەڵەتاندنی دوژمن و، پێشکەش کردنی زانیاری هەواڵگری کە سیخوڕەکان کۆی دەکەنەوە.

ئەوی ئاشکرایە سون تزو لەباس کردنی سەرکردەی نمونەیی، دەبێت ئەو ئەفسەرە، خاوەنی ئەزمونێکی فراوان و، زانیاری و، لیهاتوویی بێت ،بەبەرزترین ئاستەکانی زانست وهونەر.

لە پلەی یەکەمدا، دەبێ سەربازێکی لێوەشاوەبێت و، خاوەنی ئەزمونی هەڵمەتی سەربازی و،زانیاری چاك بێت لەسەرەتاکانی هێرش و بەرگری، کەلەکتێبەکەدا باس کراوە . دەبێ باشترین ڕێگای سوود وەرگرتن لەزەوی بزانێ، وەچۆن مانۆڕ دەکات و، باشترین ڕێگای کۆکردنەوە بزانێ، لەنێوان هێزی نیزامی وهێزی تایبەت.....هتد

دوهەم، ئەم سەرکردە نمونەیی یە، بەزمانێك باس کراوە کەلە هیچ زمانێکی ڕۆژئاوایی نابینین. بۆنمونە دەبێ هێمن وداخراوبێت ، توانای دانانی پلانی هەبێ ، کە پەی بە قوڵاییەکەی نەبرێت . ئەم گوزارشتانە زۆر لەباسی کەسێك بەکاردێت کەگەیشتبێتە ،ئاما نجی ( تاوی ) گیانی واتا ڕۆشنکەرەوە ،وەلەتێبینیەکانی دیکەی دەقەکەدا ئاشکرایە کــــــەسەرکردە تزوی نمونەیی، هەندێ لەم دۆخانەی تێدایــە : ( شارەزا بەهێمنی ونەرمی تێدە پەڕێ ، شوێنەوار ودەنگ بەجێ ناهێڵێ ،بەمەش زاڵ ئەبێ بەسەر چارەنوسی دوژمندا ). ئەم تێبینیە ناڕونانە لەسەرەتادا جێی سەرسوڕمانە ، بەلاّم وانیە، ئەگەر خستمانە ناو تێزو پەیڕەوەی تاوی( فەیلەسوفی تاوی مرۆڤێکی هاوئاوازە )- متناغم- بەتەواوی لەگەڵ دیوی شاراوەی پشت جیهانی ژیانی ڕۆژانەمان، کەلە ئەزموونی ڕۆژانەماندا ئەیزانین.

مرۆڤی وەکو ئەمە ، بەوەی کەمەبەست ونیازی خۆپەرستی هەیە بەهەرمانایەك لەماناکانی هاوشێوە، جیاوازە لەوەی کەمرۆڤی ناڕۆشن هەیەتی، ئەو بەتەواوی ولەخۆیەوە هاوئاوازە- متناغم-لەگەڵ دەوروپشتی .

وەبڕیاردان بەوەی هیچ مەبەستێکی نیە، پێویستی بەبەکارهێنانی عەقڵ نی یە، تاکو پلان دابنێ بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی وەکو ئەمە بەدڵنیاییەوە پەی بەناخی نابرێت ونادۆزرێتەوە ، سەبارەت بەکەسی وەکو ئێمەی ناڕۆشن.

ئامادەیی ئەم ڕەهەندە گیانی یە، یەکێکە لەو ڕێگایانەی کەکتێبی – هونەری جەنگ- بەجیاوازیەکی بەرچاو جیادەکاتەوە لەکتێبی بۆماوەی ڕۆژئاوا کەهەمیشە بەراوردی ئەکەن –هونەری جەنگ- ١٨٣٣ ی کلاوز فیتز-ە .سەرەڕای ئەوەی ئەتوانرێت لەچەندین لاوە بەراورد بکرێت بەکتێبەکەی سون ، بەلاّم ئەم ڕەهەندە گیانی یە ی کەمە بەتەواوی وە هۆکاری ئەم جیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبونی فەلسەفەی تاوی لەڕۆشنبیری ڕۆژئاوادا.

سەرکردەی زیرەك هەرلەخۆوە وەلام دەرەوەیە ، بەشێوەی گونجاوهەرچیەکی بێتە پێش لەبارودۆخ . و ئەمە خەسلەتێکی زیادەیە، کەدەبێ سەرکردە هەیبێ . هەروەك سون تزو ئاماژەی پێ دەکات و، کلاوزفیتزیش ئاماژەی پێ دەکات ، کەبارودۆخ خۆی دووبارەناکاتەوە. لەبەرئەوە ناتوانرێت بناغەی ستراتیژی بەوردەکاریەك دابنرێت کە بەردەوام گشت هەلوێستێك پێشەکی پێویستی پێ بێت . لێرەوە کەسەرکەوتن بەدەست دێ ئەوا تاکتیکەکانی مرۆڤ دوبارە نابێتەوە. بۆیە دەبێ مرۆڤ وەلامدەرەوەی بارودۆخەکان بێت . بەو رێگایانەی کەجۆرەکانی کۆتایی نایات .

هەرکەسێك رەفتاربکات وبیر بکاتەوە بە پێی –تاوی- لەهاوئاوازبوون–تناغم-لەگەلْ واقیع و سوود لە ووزەو ئاراستەی سیستەمی گشتی شتەکان وەربگرێت ،ناتوانرێ بوەستێنرێت . هەربە مجۆرە سەرکردەی زیرەك هەولی سەرکەوتن ئەدالە رەوشەکە . و لەشوێنکەوتووەکانی داواناکات، رەوش ئاراستەی سیستەمی شتەکان دەرئەخا کە (( تاوی )) دانا ، یەکسەری وەری دەگرێت و، وەلامدانەوەی ئەبێ ، بە زالْ بونی تەواو و، لەخۆوەی رەها .کەسی وەکو ئەمە پێویستی نی یە ، بە پشت بەستن بە پلان وکردەوەی شوێنکەوتوەکانی .

کەواتە بە وشەیەکی کورت پێویستە سەرکردەی نمونەیی خەسلەتی زیرەکی تاوی هەبێ . کەس وەلامی گونجاو ناداتەوە ، بۆ ئەو رەوشانەی کە پێشبینی ناکرێت و هەمیشە لەگۆران دایە، کەلەجەنگدا رودەدات مەگەرکەسێکی وەکو ئەم بێت.
چونکەجەنگەکان جیاوازن، لەبەر ئەوە ناتوانرێت رێسایەکی ستراتیژی دیاریکراو ، یان هەندێ تەکتیك لەسەر بناغەی یەکێکیان دابرێژرێت، کە هەمیشە سەرکەوتنی پێ بەدەست بهێنین ، وە سەرکەوتن بەدەست نایات ،تەنها بە رێسای نەرم وگونجاو وداهێنراو،

سەرباری ئەمەش سەرکەوتن لەجەنگدا پشت نابەستێت تەنها بەکاری سەربازی ، وەیەك لەنیشانە زۆر بەرزەکان لە- هونەری جەنگ-هۆشیاری رونی سون تزوە بەبوارەکان ، بواری جەنگی دەرونی ومادی وەك یەك . وە چوون بۆ جەنگ ، بەبێ دارایی تەواو ، ئەوە رەچەتەی داهێزران و وێران کردنی دەولەتە لەکۆتاییدا. جەنگ هۆکاری هەلئاوسانە و، هەلئاوسانیش توانای ئەو ولاتە ناهێلی کەجەنگ دەکات. وە تێچوەکانی ئابوری جەنگ یەك لەو هۆکارانەیە کەسون تزو ، چەندجارە توند بووە لەسەر پێویستی سەرکەوتنی خێرا : سەرکەوتنی خێرا ئامانجی سەرەکی جەنگە ،چونکە جەنگێکی درێژ خایان نی یە سود بەولاتێك بگەیەنێت.

وەهۆی دووهەم بۆ داواکردنی خێرایی پێویستی پاراستنی وەرەی سوپاو دەولەتە وەك یەك ، ئەو خالەیە کە کلاوزفیتز هەمیشە جەختی لێ دەکاتەوە . سەربازە ماندوەکان ئارەزومەندی مالەکانیانن و، بەهەمان پەرۆشی هێزی تازە ناجەنگێن. کەئەچنە ناو هەلمەتی درێژ خایان وئاگایان لەو سەختیانە هەیە، کەخێزانەکانیان دەیچێژێ بەهۆی ئابوری جەنگەوە.

ئەگەر دواکاریەکانی ئەم مەرجانە بەدی هات (( ئەگەر کەسی گونجاو سەرکردە بێ و ، توانای خەلەتاندنی دوژمنی هەبێت و،نیازەکانی خۆی لێ بیشارێتەوە و، زانیاری هەوالگری پێ گەیشت بێ لەتۆری سیخوری فراوان )) ئەوا ئامانجی کۆتایی جەنگ بەدی دێت.

ئەوەی پەیوەستە بەسروشتی ئاما نجی کۆتایی ، دێینەسەر یەکێك ، لەهەرە دژە پڕ بایەخەکانی نێوان سون تزو وکلاوزفیز ،

سەبارەت بەکلاوزفیتز، جەنگ کردارێکە لەکردارەکانی بەکارهێنانی هێز، کەئاما نجەکەی ناچارکردنی دوژمنە، بەچۆك دادان لەبەردەم خواستەکانی ئێمە. وەبەکارهێنانی هێز لەتیۆریدا هەرچەندە ناتوانری جێبەجێ بکرێ، بەهۆی ئەو بەربەستە سیاسیانەی کەسنوریان نیە.

وەسەبارەت بەسون تزوی چینی ، پێویستەهەرچەندە دەکرێ خۆمان لەوێرانکاری بەدووربگرین ، چونکە ئاما نجی جەنگ بەگشتی وێرانکردنی تەواوی دوژمن نیە، باشترین ڕامیاری لەجەنگدا گرتنی دەوڵەتێکە لەدەوڵەتانی یێکەوە گرێدراو .وەوێران کردنی، ڕامیاریەکی باش نیە. گرتنی گشت سوپای دوژمن باشترە لەوێران کردنی.

وەلە پشت ئەمەوە ئاما نجێکی دوور شاراوەتەوە ، کە نمونەی لەهیچ کتێبێکی جەنگی ڕۆژئاوادا نیە. وەزۆرترین تێبینیەکانی سون تزو کەزۆرترین گەواهی بۆ ئەمە ئەدات، کەدەڵێ: بەچۆك دادانی دوژمن بەبێ کوشتار بەرزترین نایابی یە. وەکرداری سەربازی کەمترین ڕێگای باشە یە بۆ چۆکدادانی دوژمن . لەوە بالآتر لە پلەی ستراتیژی تێکدانی هاوپە یمانێتی دوژمنە. وەلەمانە باشتر بەکارهێنانی ستراتتیژە بۆ بەزاندنی ستراتیژی دوژمن . لەنێوان گشت سەرکردەکان گەورەترینیان ئەوە نیە، کەلەسەد شەڕ سەرکەوتووبووە، بەڵکو ئەوەیە کە پێویستی بەکوشتار نیە بۆ سەرکەوتن . وەکەس نیە بتوانێ ئەمە بهێنێتەدی جگە لە – تاو - یەکی زیرەك .ئەم نمونەیەی کە ئاستێکی بەرچاوڕونی پەیڕەوکراو فەرزدەکات، کەخەڵکی ئاسایی نیانە . وەگەمژەییە ئەگەر بڵێین کەمێژووی جەنگ لەچیندا، دەری ئەخات کەئەم نمونەیە بەرجەستەکراوە. وەکو هەرنمونەیەك کەبتوانرێت لەڕووی مرۆییەوە بێتەدی.

ئەوەی بەرژەوەندی بێت تیایدا ، کە نمونە ی گریمانیە سون تزو بەلای کەمەوە پێشنیاری جێگرەوەیەکی کرد بۆ کارەساتە تۆقێنەرەکانی جەنگی ڕاستەقینە .

بە پوختی ئەمە بریتیە لەهزرە سەرەکیەکانی ئەم دەقە کورتە. بەڵام زۆر کاریگەر ،کەجێگای شکۆ بووە لەچین بەدرێژایی چەندین سەدە. وەناوبانگی تێپەڕی وەکاریگەری لەچینەوە سوڕایەوە بۆ دەوڵەتانی کۆمۆنیستی،بۆچەند سەدەیەك لەژاپۆن ئەخوێندرا وفێرئەکرا،بەدیاری کراوی لەناوەڕاستی سەدەی هەشتەمدا .وەرۆژئاواییەکان بەماوەیەکی زۆر لە پێش زانستە کلاسیکیەکانی تری چین ناسیویانە.وەیەکەم وەرگێڕانی بۆ فەرەنسی، لەساڵی١٧٧٢ز دەرکەوت بەدوایدا وەرگێڕانی ڕوسی لەساڵی ١٨٦٠ وەلەسەدەی بیستەمدا، زمانەکانی ئینگلیزی و ئەڵمانی ناسییان. وەچاپ کردنە ئینگلیزیەکەی نەوەستا ئەمەش کارێکە ڕووی نەئەدا ئەگەر سوون تزو شتێکی نەبوایە بۆ گووتن.

٣

سون تزو پێشڕەوی سیخوڕی

سون تزو بـــــه پێشرەوی سیخوڕی چینی دادەنرێت، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کـــەچین پێش ئەم سیخوڕیی نەزانیوە ، تەمەنی سیخوڕی کردن لەچین زۆر کۆنە . بەلام چاکیەکەی دەگەڕیتەوە بـــۆ سون تزو، لە پێکهێنانی یەکەم تۆڕی هەوالگری تەواو لـــەچین ، کەکتێبێکی دانا بەناوی(( بنچینەکانی جەنگ ))کەیەکەم کتێبی ناسراوە بەگشتی، لـــەسەر هونەری جەنگ .کـەتاکو ئێستاش داوای خوێندنی دەکرێت لەزۆر ئەکادیمیای سەربازی. (( ماوتسی تۆنگ )) سودی لێ بینی لەهێرشە درێژەکانی، وەژا پۆنیەکان پەیرەویان دەکرد ، پێش هێرشی - بێرل هاربەر-ی دەریایی ئەمریکی ، کتێبێکی گشتگیری بـــەسودە ، تەنانەت سەرکردایەتی فرۆکەوانی شانشینی بەریتانی، پاش ئاسان کردنی دابەشی کرد بەسەر ئەفسەرەکانیدا لە -سیلان- لەکاتی جەنگی دووەمی جیانیدا

کتێبەکە هەوڵێکی زۆری داوە، بۆ ڕوونکردنەوەی بایەخی سیخوڕەکان و، داوای کردوە بکرێنە پێنج بەش:-

١-سیخوڕی ناوخۆیی – هاونیشتمانیانی ناوخۆ کەبۆ زانیاریەکانیان پاداشتیان پێ ئەدرێت.

٢- سیخوڕی ناوەکی – نا پاکێك لەریزەکانی دوژمن.

٣-سیخوڕی گۆڕاو –بەکرێ گیراوێك کەڕازی کراوە هزرو سەرەتاکانی خۆی بگۆڕێ .

٤- سیخوڕی فەوتاو- بەکرێ گیراوێك ڕاهاتوە زانیاری درۆ بداتە دوژمن کەڕەنگە دواتر بکوژرێت.

٥-سیخوڕی ماو-ڕاهێنراو . پشتی پێ دەبەسترێت کەلەئەرکەکەی بەسەلامەتی بگەڕێتەوە .

ڕای سون تزو وایە ،جەنگ کردن بەڕیگەیەکی ئابوری لەگەڵ بەرگری کردن لەولات دژی ئەوانی تر ، پێویستی بەبەکارهێنانی سیستەمی سیخوڕی هەمیشەیی هەیە. کەچاودێری چالاکیەکانی دراوسێ و دوژمنان وەك یەك بکات. وە پێویستە وای دابنێین کەسیخوڕی کارێکی شەرەفمەندانەیە . وەسەرنجی نزیك بونەوی بەردەوامی بەکرێگیراوان بدەین، لە پێشەوا سیاسیەکانیان و، سەرکردە سەربازیەکانیان.

سون تزو لەکتێبەکەیدا، ڕاسپاردە دەدا بەچاك مامەڵەکردن لەگەڵ بەکرێ گیراوە گۆڕاوەکان ، خانوی خۆشیان بدەنێ ، ناوەناوە پاداشتتیان بکەن، چونکە ئەمە ئەبێتە هۆی جێگیربونی دڵسۆزیان ،بەڵکو لەخشتەبردنیشیان کە هەوڵ ئەدەن بە پارە هاوڕێکانیان وسەرۆکەکانی پێشتریان ڕاکێشن. بەتایبەتی ئەوانەی بەئاسانی بەرتیل وەردەگرن،

٤

سون تزو و حزب الله

کەوتنی ئەفسانەی سوپا گەورەکان

لەگەڵ بەڕێوە چونی ئاگربەستی نێوان ئیسرائیل وحزب الله ، پاش چەندین شەڕی یەکتر هاڕین ، لەساڵی ٢٠٠٦ چاودێران پێیان وابوو مانگێکی جـەنگ، ، دڕکێکی کۆمەڵی لوبنانی نەشکاند، کتێبی بیرمەندی چینی سون تـزوو پێش ٢٥٠٠ ساڵ لێکولینەوەئەدا لەچۆنیەتی سەرکەوتنی کۆمەڵی بچوك، بەسەر سوپای نیزامی گەورە لەجەنگی نابەرامبەردا.

سون تزو لەکتێبەکەیدا( هونەری جەنگ ) ) وای دەبینێ کەهێزی ژمارە کەم، کـەهەڵوێستی بـەرگری کردن وەردەگرێ، پێویستە لەژێر زەوی شاراوەبێت تاکو دوژمن نەیبینێ ، وەرگرتنی هەڵوێستی لەم جۆرە لەدۆخی نابەرامبەری هێز ، واتـای نــەرێنی نی یە، بەڵکو دروست کردنی کەشێکی گونجاوە بۆ لێچۆڕینی سوپای هێرش بەر ، وەبلیمەتی بریتی یە لــە کۆکردنەوەی نێوان ، بەرپێگرتنی هێرشەکان و، هێرش کردنی فێلاوی .
ناپلێۆن پۆناپارت لەخوێندنەوەی کتێبی – هونەری جەنگ – نەدەوەستا، تەنانەت لەگەرمەی شەڕیشدا. وەهەروەها سەرۆکی ئەمریکا- تیۆدۆر رۆزفلت – هەمیشە ئەم کتێبەی خوێندوەتەوە ، کەگەیشتوەتە نزیکەی سەد جار. بیرمەندی بەناوبانگی میسری – ئەنوەر عەبدولمەلیك – ئاماژە بەگرنگی ئەم کتێبە دەکات ، لە وتارێکیدا بەناونیشانی (( سەرەتای مێژوو لە سوێسەوە تاکو قانا )) بەبۆنەی هاوکات بوونی نیوسەدە لەخۆماڵی کردنی کەنداوی سوێس ،لەگەڵ بۆردومان کردنی گوندی قانای لوبنانی لە لایەن ئیسرائیلەوە ،کەبوە هۆی کوشتنی زیاتر لە٦٠ هاووڵاتی کە ٣٧ کەسیان منداڵ بوون ، هەروەها عەبدولمەلیك ئاماژەی دا بەوتەیەکی -تزوو – کەئەو بەمامۆستای مامۆستایانی بیری ستراتیژی جیهانی ناوی دەبا کەدەڵێ:- بەدەست هێنانی سەد سەرکەوتن لەسەد جەنگدا لوتکەی بلیمەتی نیە . کەستراتیژی هێرش کردن پو خت ئەکرێتەوەلەوەی ملکەچ پێکردنی دوژمن بێ کوشتار لوتکەی بلیمەتی یە.

وەکتێبی هونەری جەنگ بایەخ ئەدات بەجەنگی پارتیزانی سەبارەت بەکۆمەڵی بچوك کە لەخاکی خۆیدا بەرگری دەکات بەرامبەر هێزێکی نیزامی گەورە( ٣ )

---

٣ )-هێزی

پێشمەرگەی کوردستان بەدرێژایی ماوەی دروست بوونی دەوڵەتی عێراق هەتا ئەمرۆش بەهێزێکی کەمی پارتیزانی وبە پشتیوانی خەڵکی کوردستان ڕوبەڕوی گەورەترین سوپای دا پلۆسێنەری ناوچەکەبوەتەوە وخاوەنی چەندین داستانی گەورەی ڕوبەڕوبونەوەیە وسوپای نیزامی زەبەلاحی دەوڵەتی عێراق نەیتوانیوە بیبەزێنێ وئەوان ناچاربوون داوای گفت وگۆیان کردوە وگەلی کورد بەهۆی بەرخودانی بەردەوام ماوەتەوەو لەناو نەچووە ئەمە لەگشت پارچەکانی دیکەی کوردستان هەتا ئێستاش هێزی پارتیزانی پێشمەرگەو گەریلا دژی هێزە زەبەلاحەکانی تورکیا وئێران بوونەتەوە .

( حزب الله ) سەرکردایەتی بەرگری کردنی کرد دژی ئیسرائیل وناچاری کرد کۆتایی بەداگیر کردنی باشوری لوبنان بهێنێ لەساڵی ٢٠٠٠ حەسەن نەسرولا ئەمینداری گشتی - حزب الله -زیاتر لەچەند جارێك جەختی کردوەتەوە کەچەکدارەکانی شێوازی شەڕی پارتیزانی ئەگرنە بەر لەبەرەنگاربوونەوەی هێرشی سوپای ئیسرائیل لەلوبنان . چاودێران وای دەبینن کە چەکدارەکانی -حزب الله –ئەوانەی کەس نایانبینێ ستراتیژی خۆپۆشین وخۆشاردنەوە یان گرتبوەبەر هەروەك چۆن دانای چینی ئامۆژگاری داوە لەسەدەی پێنجەمی پێش زایینی.

وەلە پێشتردا شەڕی پارتیزانی لەڤێتنام ، سەرکەوتنی بەدەست هێنا لەبەرەنگاربوونەوەی گەورەترین سوپا کەسوپای ئەمریکی بوو، کەناچاربەکشانەوەی کرد پاش چەندین ساڵی شەکەت کردن و، وزەلێبڕینی، لەو کاتەوە کەسوپای ئەمریکی سەدان هەزار سەربازی خۆی نارده ڤێتنام لەسەرەتای شەستەکان . وەهێزەکەی ئەمریکا زۆرترین چەکی تاقیکردەوە ، جگە لەچەکی ئەتۆم . بەلاّم شکستی هێنا لەڕووبەڕووبوونەوەی شۆڕشی گەلی وشەڕی پارتیزانی . هەتا داگیرکەری ئەمریکی لەساڵی ١٩٧٢شکا.

سون تزو دەڵێ:- ئەو سوپایەی هەڵوێستی بەرگری وەردەگرێت، پێویستە وەك ئەوکەسەبێ کەخۆی لەناخی زەویدا دەنێژێت، تاکو دوژمن جموجۆڵی نەبینێ ،لەئاماژەیەکدا لەوەرگرتنی هەڵوێستێکی ئاوادا ، لەدۆخێك کەهاوتای دوژمن نیمان، واتای ئەرێنی نیە. چونکە بەرگری دوو هۆکاری ئەرێنی دەگرێتە خۆ ،ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ هێرش،ئەودوو هۆکارەبریتی یەلە قۆرخکردنی سروشتی جوگرافی و ، پەیرەو کردنی شێوازی لێلی و، فێڵ و ،خۆشاردنەوەو، خۆپۆشین بۆ شلەژاندنی دوژمن. لەگەڵ ئاگاداربوون لەوەی، کەمەبەستی سەرەکی بەرگری، دروست کردنی دۆخێکی لەبارە کەبتوانی هێرش بکەی .

بەرگری کردن جوڵەیەکی سەربازی نیە، کەزرێکانت درێژ بکەیتەوە تەنها بۆ پەرچدانەوەی هێرشەکانی دوژمن . بەڵکو واتا بلیمەتی لەکۆکرنەوەی نێوان ڕوبەڕوبونەوەی دوژمن و، هێرش کرنە سەری.

وەنمونە ئەدات لەخۆپۆشین و فریودانی دوژمن کەدەڵێ:- ئەگەر دەتەوێت دوژمنت فریو بدەی، دەبێ هەمیشە کەسایەتی یەکەی قۆرخ بکەی، کەهەمیشە خۆی لەبەدەست هێنانی بەرژەوەندی دەبینێتەوە . بۆیە نێچیرێکی بەنرخی پێشکەش بکە، تافریوی ئەدات بەقوتدانی و، ئەکەوێتە ناو ئەو تۆڕەی بۆت ناوەتەوە. لەوکاتەدا هەڵئەکوتیتە سەری وڕاوی ئەکەی. ئەگەرچلێس بوو ، بۆ داگیرکردنی ناوچەیەکی ستراتیژی قەلەمڕەوی ، تۆ ئەتوانی وای بەخەیاڵدا بێنی ، کەدەرفەتێك هەیە ئەتوانێ بیقۆزێتەوە . ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوەی بە کەلەڕەقی ڕەفتاربکات و، هەڵەیەك بکات کەلێ خۆش بوونی نیە، بە مجۆرە دەرفەتێکت لە پێشدا دەبێت ، هێزەکەی هەرچەندە بێت ، بەرەو فەوتانی ببەیت .

کۆی قسەکان ، پێویستە دوژمن ناچار بکەی هێزەکەی خۆیت بۆ دەرخا، تاکو لەبەرژەوەندی خۆت بیقۆزیتەوە . نوسەر ئامۆژگاریمان دەکات ، کەخۆمان لادەین لەبەرەنگاربونەوەی ڕاستەخۆ لەگەڵ دوژمنێك، کەخاوەن هێزێکی گەورەی شەڕکەرە. نوسەر دەڵێ:-ئەو جەنگەی لە دۆخی ئاوادا دەتوانین بیکەین بەدیهاتنی لێدانێکی گەورەیە کە پێی ببەیتەوە لەدوژمن ، بەلاٖم جگە لەمە دەبێ خۆت لابدەی وە هەمیشە بیرت بێت، کەسوپای لاواز کەسەربازەکانی سوورن لەسەر شەڕکردن، دژی سوپای دوژمنی بەهێز ، بێ ئاوڕدانەوە لە پاراستنی هێزوژیانیان ئەوابە ئاسانی دەبنە دیلی دەستی دوژمن .

کشانەوە لەبەرامبەر دوژمنێکی بالاّدەست لەهێزدا ، تەنها پاراستنی هێزەکەت نیە لەمەترسی ، بەڵکو هەوڵێکە بۆ فریودانی دوژمن و، توش کردنی، هەتاکو دەرفەتێکت بۆ دروست دەکات، کەبیقۆزیتەوە بۆ بەرەنگاربونەوەی . لەهەندێ کاتدا کشانەوە بەمەبەستی هاندانی دوژمن بۆ دواکەوتنمانە، تاکو بتوانین لەناوچە قایمکراوەکانی و ، سەنگەرە سەختەکانی، دەری بهێنین . ودەرفەتمان دەست بکەوێت، بۆ هەڵکوتانە سەری.

٥

**کتێبی(( هونەری جەنگ )) و شوێنی لەمێژوودا**

**ئەم کتێبە، هەتاکوو ئێستاش لە چین بەناوی – تسو –دەناسرێت . کەزنجیرە داڕێژراوێکی کۆمەڵی یە لەساڵی ٢٣٠٠ پێش زا ین نوسراوەتەوە لەناوچەی باکوری چین. ، کە دەق وهزری ستراتیژی گشت ڕۆژهەلاتی ئاسیا پێکدێنێ. تاڕادەیەکی زۆر تێڕوانینێکی تازەی پێشکەش کرد پەیوەست بەململانێ. بە پێی ئەوە مرۆڤ ئەتوانێ سەرکەوتن بەدەست بهێنێ بێ ئەوەی بچێتە جەنگ . ئەم دەقە لەڕۆژئاوا بەهونەری جەنگ ناسراوە بەلاِم لەچین بەناوی دامەزرێنەری بنەماڵەوەیە .ئـــــــەم دەقە خۆش و وروژێنەرە کەیەکە مجار - کامل یوسف حسین – کردویەتی بە عەرەبی ، ڕونی دەکاتەوە کە چۆن بێ دوژمنایەتی سەردەکەوین ؟ کەجەنگەکەمان گەورەبێت یان سنورداربێت . تاکەکەسی بێت یان نەتەوەیی ، یەکێك لەبەناوبانگترین ووتەکانی دەڵێ(( سەد سەرکەوتن لەسەد شەڕدا بلیمەتی بالاَ نیە ، بەلاَم ملکەچ کردنی بەرامبەر بە بێ جەنگ بلیمەتی بالاَیە )) ئەمە پەندی کارپێکراو وکاریگەرە لەڕێگاکانی مامەڵەکردن لەگەڵ ململانێدا ، کەسون تزو بـــەزانینی ئەم ململانێیە دەست پێدەکات ، کە دانەبڕاوە لەژیانی مرۆڤ ، ئەوە لەناخماندایە**

ولــەچواردەورمانە. هەندێك جار بەزیرەكی خۆمانی لیَ لادەدەین و، هەندیَ جاریش ناچارین بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ خۆمانی تیا هاوین ، زۆریك لەئێمە هێزی وێرانكەری دوژمنی بینیوە ، چ لـــە ئاستی تاكەكەسی، یان لەكارەساتەكانی ململانێی چەكداری. سون تزو ئامۆژگاری ئەدا ، كە وەلاَممان بۆململانیَ بەناسینی خۆمان و ئەوی تر دەست پیَبكات ،كەلەوەرزی سێیەم بەكەڵكمان دێت . بە مجۆرە دەبیَ لەڕیزی سەربازیەكاندا :

ناسینی بەرامبەر و خۆناسین

،لەسەد شەڕ هیچ ناترسین

نەناسینی بەرامبەروناسینی خۆمان

،سەركەوتن بەرامبەر شكستە بۆمان.

نەناسینی خۆت ونەناسینی بەرامبەر،

بەزینییكی دڵنیا یيە لەگشت شەڕ

ئەم زانستانە ناوبانگیان پەیداكرد ، كەئەخرانە پاڵ كۆنفۆشیۆسی گەورە ، كەكتێبەكە هەمیشەدەڵیَ:-

مامۆستا گوتی و، مامۆستا ڕایگەیاند، هەروەها لەزانستی -تاوی - پێكهاتووە وناوبانگی گەورەی بۆ ئەم دەقە هێنا ، كەلەسەر تابلۆی حەیزەران یەكەمجار كەنوسرایەوە و ، پاشان بنەماڵەكانی چینی گواستیانەوە ولـــەجیهاندا بلاَوبووەوە .

بەدڵنیاییەوە زۆربەی سەركردەكانی جیهان و مێژوو ئەم كتێبەیان خوێندوەتەوە ، بەهایەكی گران وگە نجینەیەكی بەنرخە .ئەم كتێبە هەواڵگری ئەمریكا بەسەرجەم ئەندامانی خوێندویەتیەوە بەڵكو زاراوەكانیشی بەكارهێناوە . هەركە زاراوەی هێزی ڕەق و هێزی نەرم دەركەوت لەدراما ستراتیژیە ئەمریكیەكان زۆر كەس زۆر بەسەرسامیەوە پرسیاریان لەسەرچاوەكەی كرد . بەلاَم ئەوانەی خەریكی درامای ڕۆژهەلاَتین بەخەندەوە بیَدەنگ بوون

سون تزو دەڵیَ:-

كراسێك بكە لەئازایەتی

ئەمە – تاو- یە پڕ دانایەتی

ڕەق ونەرم بەدەستت بكەوی

ئەمەیە شێوازی زەوی

لەدابەش کردنە نوێیەکەی کتێبەکەدا بۆ جێبەجێ کرنەکانی هونەری جەنگ دابەش دەبێت ، پاشان بەشی دوهەمی بۆ سێ ووتار، کەبریتییە لەوەرگرتنی شتەکان بەتەواوی وەك: سروستی شتەکان و، پەیوەندیەکان و، لیکچواندن . کە هێزی فەرمانڕەوایە و زاڵ بونیەتی بەسەر ئەوانی تر و، توانای کاریگەری لەسەریان لەدوورەوە . وەبەهاتنی سەردەمی سون تزو، خەڵك خەریك بوو تێدەگەیشتن ، کەئەم هێزە، شاراوەی ناوکەسی فەرمانڕەوا نیە، بەڵکو لە پایەکەیدایە. هەروەکو دەقێکی کۆن ئاماژەی پێ ئەدا .

ماری بازدەر لەتەمەوە دەرئە پەڕێ

ئەژدیهای فڕیو لەبان هەورەوە دەرئە پەڕێ

بەلاٍم کاتێ هەور تێ ئە پەڕێ وتەم ڕەوی

هەردوکیان جیاواز ئەبن لەدیوانی زەوی

دواتر وەرزێکی خۆشت دێتە پێش لەسەر سەرکردەی دانا، کەبەرنامەیەکی ناوخۆیی بۆبەجی دیێڵێ ، کەدان بەخۆداگرتن و ، ژیری و، ناوەڕۆك زانینە . بەلاٍم لەسەرشانۆی شەڕ ، کۆمەڵێ ڕاسپاردەی بۆ دێنێ:

ئەگەر سەرکردە سەرنەکەوێت بەسەر توڕەبونیدا

وەجڵەوی دایە دەست سەربازەکانی ووەکو سەرخۆش دەرپەڕین

ئەوا سێیەکی ئەفسەرەکان و، سەربازەکانی ئەکوژرێن

وەشارە شورەدارەکە بە سەختی ئەمێنێیتەوە

ئەمە کارەساتی هێرش کردنە

خۆشترین کتێبە کەخوێندرابێتەوە سەرباری ئەو پەندانەی کەلە دووتوێیدا نوسراوە هەروەها بەشدارە لە ڕەوانی شێوازو ، گوزارشتی ڕێك وجوانی و، شاعیرێتی خێزان و، بەرنامە بۆژیانی کەسەکان . وەئەم گوزارشتە واتای زۆری تێدایە دەبێ هەموان بەکاری بهێنین".

هێرش مەکە سەر هێزە بەئاگاکان

خۆراکی سەرباز قوت مەدە

فشارمەخەسەر داگیرکەری شەکەت

**ڕێگایەك بکەرەوە بۆ سەربازە گەمارۆدراوەکان**

**ڕاویان مەنێ کاتێ خەریکی کشانەوەن**

**ڕووبەڕوویان مەبەرەوە هەرکە لەسەرگردێکی بەرزن**

**نیازیان مەکە کە پشتیان بەڕەبیەیەکەوەیە**

**نزیك بەکاربێنە بۆ چاوەڕوانی دوور**

**پشوو بەکاربێنە بۆ چاوەڕوانی شەکەتی**

**تێری بەکاربهێنە بۆ چاوەڕوانی برسێتی**

**ئەمەیە دەناسرێ بەئاراستە کردنی فەرمان بۆ هێزەکان**

**پێکدادان مەکە لەگەڵ هێزی باش ڕێکخراو**

**مەدە لە پێکهاتەی بەشکۆ**

**ئەمەیە دەناسرێ بەئاراستەکردنی فەرمان بۆ گۆڕین**

**ئەم کتێبە سیازدە بەش دەگرێتە وە، بە مجۆرە دابەش کراوە – پلانەکان، ئۆپەراسیۆنەسەربازیەکان ، ستراتیژی هێرش کردن ، ئامادەکاریەکان ، هێز ، خاڵە بەهێزو خاڵە لاوازەکان ، ململانێی چەکداری ، نۆ گۆڕاوەکە، ڕێ کردن ، شوێنەکانی زەوی ، نۆ جۆرەکەی زەوی، هێرش بەئاگر، بەکارهێنانی سیخوڕە نهێنیەکان..**

**سون تزو شاکارەکەی لەدەیەی یەکەمی سەدەی پێنجەمی پێش زاینیدا نوسیوە ، کەکۆپی یەکی کتێبەکەی پێشکەشی پاشا( هلو ) کردلەساڵی ٥١٢ پێش زاین. ئایا سون تزو سەرکەوتوو بوو لەجێبەجێ کردنی زانستەکانی؟ وەڵام بەڵێ –باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە پاشا- هو –پێی هەستاو ، توانی دراوسێکەی مل کەچ بکا و سنوری فەرمانڕەواییەکەی فراوان بکات، بە پشتیوانی ڕاوبۆچونەکانی سون تزو . جگە لەمە زانستەکانی سون تزو لە پاڵ زانستەکانی تری کۆنفۆشیۆسی و، تاوی بێ وەی، ڕاستەوخۆ یارمەتیدەربوو، کە میرنشینی کیم توانی ئیمپراتۆریەتی چین یەك بخات لەساڵی ٢٢١ پ .ز.**

**-هونەری جەنگ – کۆمەڵێ سەرەتای سەربازی چینی یە، کەلەساڵی ٢٣٠٠پ. ز نوسراوە ، ،کەفەیلەسوفی چینی سون تزو دایناوە، بۆ مسۆگەرکردنی سەرکەوتنی سەربازی بەکەمترین تێچو و،خێراترین ڕێگا . هەرسەرەتایەك لەیەك دێڕ ، یان دوو دێڕ تێپەڕ ناکا، کەلە چەند وەرزێك ڕێکخراوە ، بە( ئامادە کردنی پلان )دەست پێ دەکات وبە( سەربازکردنی سیخوڕەکان ) کۆتایی دێت .**

ئەوەی سەیرە سون خۆی دژی جەنگ بووە (( وەك ڕێگایەك بۆ چارەسەری کێشە ))بەلام ڕاستەوایی بوو کاتێ دەیگووت شەڕ هە ر دەبێت و مەحالە ڕێگری بکرێت ، لەبەرئەوە بڕیاری دا کۆمەڵێ سەرەتا بنوسێتەوە ، بۆ دڵنیایی سەرکەوتن ، بەکەمترین زیانی مرۆیی (( بەڵکو بەبێ ڕۆیشتن بۆ گۆڕەپانی شەڕ )) .

کتێبەکە، هەتاکو ئێستاش ، بەبناغەی ستراتیژی سەربازی دائەنرێت لەچین ، هەروەکو گوتمان لەساڵی ١٩٧٢ زانایانی شوێنەوار، پێنج بەشی نادیاریان دۆزیەوە و، خرایە سەر ئەودانەیەی کەهەیە.

٦

وانە بەسودەکان لە سون تزو

هیچ کتێبخانەیەك لەکتێبخانە گەورەکانی جیهان نیە، کە دانەیەك لەکتێبی (( هونەری جەنگ ))ی تێدانەبێت ، کە بیرمەند وفەیلەسوفی سەربازی چین سون تزو نوسیویەتی. ئەم کتێبە بەگرنگترین کتێب دائەنرێت، کەلەسەر ستراتیژی سەربازی نوسراوە . وەلەژیانی سون تزو زۆر نازانرێت ، یان ئەو ماوەیەی کەتێیدا ژیاوە . بەلاٍم هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە ئەدەن، کەهاوسەردەمی فەیلەسوفی چینی(( کۆنفۆشیۆس — ٥٥١ پ ،زبۆ ٤٧٩ پ،ز ))بووە . لەوشوێنە لەدایك بووە کەئێستا پێی دەڵێن ویلایەتی (( شاندنج ))ی چینی، لەکاتێکدا — سامۆئیل گریفس-ی وەرگێڕ بڕوای وایە کە — سون تزو-ڕەنگە لەنێوان ساڵانی ٤٥٣ و٢٢١ پ،ز ژیابێت . چونکە وردەکاریەکانی کتێبەکە، ئەگونجێ لەگەڵ ئەو ماوەیەی کەجەنگی نێوان دەوڵەتانی تێدا بووە . کەبووە هۆی یەکخستنی چین بۆیەکەمین جار، لەژێر (( ئیمپراتۆریەتی جن ))کەزۆر بەردەوام نەبوو.

ئاشکرایە کە -سون تزو—سەرکردەیەکی سەربازی بووە، لەیەکێك لەم دەوڵەتە شەڕکەرانە. خۆی تەرخان کرد، بەنوسنەوەی ئەزمونە سەربازی وتەکتیکیەکانی ، بۆ نەوەکانی داهاتوو . وەنوسینەکانی جێ پە نجەی بەجێهێشت لە نوسینە سەربازیـــەکانی چینی هاوچەرخ.

لەکاتی ئێستاشدا سوپایەك پشت دەبەستێ بەوەی — سون تزو- نوسیویەتی. بـــەڕوونی ئـــەوان بڕوایان وایە ، کەزانست وئەزمونەکانی کەلەکتێبەکەیدا تۆماری کردووە . بایەخی زۆری هەیە لـــەستراتیژی سەربازی هاوچەرخ. وەلەکاتی جەنگی

(( ڤێتنام ))دا ئەفسەرانی سوپای ئەمریکا، جەختیان لەهەڵگرتنی دانەیەك لەکتێبی (( سون تزو ))و ( ماوتسی تۆنگ ) دەکردەوە ، بەڵام کەمێکیان لەوانەی هەڵیان گرت بوو، خوێندبوویانەوە و ، کەمترینیان بەدروستی لێی تێگەیشتن .

( ماوتسی تۆنگ )، هزرەکانی( سون تزو )ی پەیڕەوکرد لەنوسینەکانی خۆی ، سەبارەت بەجەنگی میللی چین لە سیەکان وچلەکانی سەدەی رابوردوو. هەروەها هەردووسەرکردەی ڤێتنامی (( هۆشی منە )) و(( فوجیاب ))سودیان لە پەندەکانی. –سون تزو –بینی، لەجەنگی ڤێتنامی، لەدژی فەرەنسیەکان و، دواتر لەدژی ئەمریکیەکانیش.

لەبەر ئەوە زۆرێك وایدەبینن کەکتێبی( هونەری جەنگ )، ئەگونجێ لەگەڵ ستراتیژی دەوڵەتانی لاواز. لەبەر ڕۆشنایی ئەو گفت وگۆیانەی کەدەکرێ سەبارەت بەجەنگی ناهاوسەنگ . ئەوا خوێندنی کتێبی( هونەری جەنگ ) لەکارە هەرە پڕ بایەخەکانە، بۆ سەرکردە سەربازیەکان و، پلان دانەرە ستراتیژیەکانی دەوڵەتانی هەرەلاواز. ، بەلاّم لەهەمان کاتدا، ئەم هزرانە بۆ دەوڵەتـــانی تریش ڕەخساوە لەهەردوو باردا، دەبێ سەرکـــردە سیاسیەکان و، سەربازیەکانی دەوڵەتـــەبەهێزەکانی وەك ویلایەتە یــــەك گرتووەکانی ئەمریکا، هزرەکانی سون تزوو بخوێننەوە . چونکە ئەگەر بەکاری نەهێنن ئەوا پێویستە خۆیان بپارێزن، لەوانەی کەبەکاری دێنن .

(( گریفس )) ی نـوسەر ، کەیەکێکە لەو خانەنشینانەی کەبەشداری جەنگی دوهەمی جیهانی کردووە. پاشکۆیەکی تەرخان کردوە لەکتێبەکەیدا ، ڕونی دەکاتەوە کـە چۆن ژاپۆنیەکان ، پەندەکانی سون تزویان جێ بەجێ کردووە ، تیایدا دەڵێ:- ژاپۆنیەکان ١٠٠ دانە لەکتێبی ( هونەری جەنگ ) یان بلاّو کردەوە . وەپەندەکانی (سون تزو) یان جێ بەجێ کرد، لەگشت بوارەکانی ژیان دا ، لەناویاندا کاروباری بازرگانی.

–سون تزو- و –کلاوسفیتز- هەریەکەیان لەدولای پێچەوانە بەیەك وەستان ، سەبارەت بەچەمکی جەنگ . کلاوسفیتز، والەجەنگ دەڕوانێ ، کەبەردەوامی یە لەڕامیاری ، بە ئامڕازی تر. بەلاّم –سون تزو- وای دەبینێ، کەئـــامڕازێکە ، لـــەنێوان چەندین ئامڕازی ڕامیاری، کەسەرکردە ڕامیاریەکان ئەتوانن بەکاری بهێنن، بۆ گەیشتن بەمەبەستەکانیان . ئـــــەم جیاوازیەش، ڕەنگدانەوەی جیاوازی نێوان ستراتیژی ولایەتەیەکگرتوەکانی ئەمریکاو ، ڤێتنامی یە باکوریەکان بوو لـــەجەنگی ڤێتنامدا، هــــەروەك هۆیەکانی شکستی ولایەتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا ڕوون دەکاتەوە لەوجەنگەدا.

لە پێشانگای شیکاریەکانی بۆ جـەنگی ڤێتنامی – هاری سمەرز-چـــاودێری گفت وگـۆیەکی دەکرد ، لەنێوان عەقیدێکی سوپای ئەمریکی و، هاوتـا ڤێتنامی یەکـەی لەشاری –هانۆی- لـە پاش جەنـــگ. کـەئەفسەرە ئەمریکی یەکە گوتی: هــەرگیز ڤێتنام لەگۆڕەپانی جەنگ ویلایەتەیەکگرتـــوەکانی ئەمریکا ی نـــەبەزاندووە ، سەرەڕای پـــەسەندکردنی ئـــەم قسەیە، ئـــــەفسەرە ڤێتنامیەکە گوتی:-ئەمە پەیوەندی بەباتەکەوە نی یە چونکە جەنگ، بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن نیە لەمەیدانی شەڕ. وەلەهەوڵێکدا بۆگەمارۆدانی هەڵەکان کەنوسەر بڕوای وایە بوە هۆی بەزینی ئەمریکی یەکان لەڤێتنام ، بەڵگەی نەداوە بە–سون تزو-بەڵکو بەڵگەی داوە بە تیۆریەکانی- کلاوسفیتز-سەرەڕای دروستی زۆرێك لەو

**خالآنەی دەریخستوە . بەلاٍم پەیوەندی نیە بەهەوڵەکانی ئەمریکا لەڤێتنام. چونکە هەریەك لە-سمەرز- وپلان دانەرە ستراتیژیەکان، کەپلانی جەنگی ڤێتنامیان داڕشت، باش لەسروشتی ئەو جەنگە تێنەگەیشتبوون کەدەیان گێڕا.**

**ئەو پێشوازیە گەرمەی کتێبەکەی –سمەرز- بەخۆیەوە بینی ، لە ئاستی سەرکردە سەربازیەکانی سوپای ئەمریکا ، نیشانەی ئەوەیە کەسەربازیە ئەمریکی یەکان، هێشتا تێنەگەیشتوون لەوەی کەلەڤێتنام رووی داوە. چونکە ستراتیژی ڤێتنامی یەکان هەروەك ستراتیژی دەوڵەتانی رۆژهەلاتی ئاسیا ، تاڕادەیەکی زۆر لەوفەلسەفە سەربازیە دەچێ کە- سون تزو- دایڕشتووە ، زیاتر لەهزرەکانی کلاوسفیتز یان ستراتیژیە رۆژئاواییەکانی دیکە.**

**بڕوای سەرکردە سەربازیە ئەمریکا ییەکان، بەوەی کەژمارەیەکی کەمی سەربازی هێزەتاییەتەکان لەوانەیە هێزەکانی هاوپەیمانی باکوری ئەفغانستان هان بدات بۆبەزاندنی سیستەمی تالیبان، بەبێ بەشداری پێکردنی هێزی زۆری وشکایی ئەمریکی ، بەڵگەی ئەوەیە سەرکردایەتی یە سەربازیە بالآکان هێشتا لە وانە بەسودەکانی- سون تزو – تێنەگەیشتوون یان پێی ڕازی نین .**

**لەکاتی جەنگی درێژخایانی هندی چینی ، سەرکردە فەرەنسیەکان و ئەمریکیەکان، بێ ئە نجام هەوڵیان ئەدا بۆ ئەوەی نەیارەکانیان لەسوپای –فیت منە- و-فیت کۆنج-و سەربازەکانی ڤێتنامی باکور ، بخزێننە ناو پێکدادان لەگەڵیاندا لەباروودۆخی شیاودا، کە پێشتر هێزی ئاگر و ، مانۆڕو ، پشتیوانی و ، خۆراکی ئە نجامی شەڕەکەی یەکلاکردبێتەوە .**
**ئەمەش لەشەڕی –دیان بیان فۆ-لەگەڵ فەرەنسی یەکان و ، لەشەڕی –کیەسیان- لەگەڵ ئەمریکیەکان روویدا . شکستی فەرەنسیەکان زۆر نەبوو بەچەمکی سەربازی ، بەلاٌم رۆڵی گەورەی هەبوو لەڕوی دەرونی یەوە، کەوای لێ کردن لەهندی چینی بکشێنەوە.**

**لەشەڕی –کیەسیان-هێزی چەکداری ئەمریکی هێنرایەناوناوچەیەکی سنوری ، کە کەندولەندی کەمێ**
**باشتربوولەکەندولەندی –دیان بیان فو-لەکاتێکداهێزەکانی – فیت کونج- لەناوچەئاوەدانیەکانەوە ، هێرشیان کرد.**
**وهێزەکانی –فیت کونج- شەڕی شارەکانیان بردەوە .**

**هێرشەکەی هێزەکانی – فیت کونج- کاریگەری دەرونی نەرێنی کردە سەر رای گشتی ئەمریکی، کەمتر نەبوو لەو کاریگەریەی کەجەنگی –ریان بیان فو-دروستی کرد لەسەر فەرەنسیەکان ، کەویلایەتەیەکگرتوەکان شەڕەکانی دەبردەوە بەلاٌم جەنگەکەی دۆڕاند، چونکە جیاوازی نێوان جەنگ گێڕانی خۆیان وجەنگ گێڕانی دوژمنەکەیان نەدەزانی . چونکە- سون تزو- وریایی داوە لەوەی خۆناسینمان ونەناسینی دوژمنمان دەرفەتی سەرکەوتنمان ئەکاتەنزیکەی نیوە.**

**ئەم جیاوازیەش لە تێگەیشتن لە سروشتی جەنگ،نیشانەیەکی سەرکەوتووی بەرنامەی جەنگ گێڕانە، کەئێستا دەوڵەتە لاوازەکان پەیڕەوی دەکەن. بەرنامەیەکە بایەخ دەدات بەفێڵ و مانۆڕ زیاتر لە بایەخ دان بە هێزی ئاگر، هەوڵ ئەدات بۆ دانانی شێوازی جەنگ، تەنانەت پێش ئەوەی دوژمن بە سەرەتاییەکانیشی بزانێ. لەمەش گرنگتر ئەوەی ئەم بەرنامەیە**

پەیڕەو دەکات ، ئەزانێ کەگۆڕەپانی یەکلاکەرەوەی جەنگ ، کە مجارئەوەیە کەهێزەکانی تێدا بڵاوکراوەتەوە ، بەڵکو گۆڕەپانی جەنگ ، والەدوو تویێی ئەو ئیرادە ڕامیاریەی کەدوژمن هەیەتی و، لەناو دڵ وعەقڵی هاووڵاتیاندایە،

بەوەی کە پێشتر ڕوون کرایەوە، دەبێ سەرکردە سەربازیە ئەمریکیەکان ،لەو وانە بەسودانەی–سون تزو – لـــەسەر جەنگ گێران تێبگەیشتنایە . وەدەبێ سەرکردە سیاسیە بڕیاردەرە ستراتیژیەکان لەمە تێبگەن.چونکە دوژمنەکانیان، چاودێری باشی شێوازی بیرکردنەوەیان دەکەن و، گۆڕانی شێوازی بیرکردنەوەش هەروا سانا نیە . ، چونکە ئەمە بەر ئەو بیروباوەڕانە ئەکەوێ کەڕەگی قوڵیان هەیە.

زۆربەی وانەکانی –سون تزو- دەخرێتە لیستێکەوە پێی دەگوترێت- جەنگی ناسیستەمی- پێشتر ئەم ڕۆڵە تەسك کرابووەوە، بۆئۆپەراسێۆنەکانی پشتیوانی لەهەوڵەکانی سەرۆك ، لەجەنگی سیستەمی. ئەمەلەکاتێدا بەرنامەی –سون تزو- ئەچێتە چوارچێوەی جەنگی ناسیستەمی ، هەروەها گفتوگۆی کردوە لەسەر قەبارەی هێزی سیستەمیی کەداواکراو ە بۆ کارکردن ، دژی دوژمن . بۆیە دەکرێ هێزی سیستەمی لە- سون تزو- ەوە فێربێت . هەروەکو چۆن جەنگاوەرانی پارتیزانی لێوەی فێردەبن.

–سون تزو- دەڵێ:- تێکشاندنی دوژمن بـــــەبێ کوشتار ،شارەزاییەکی زۆرتری دەوێ لەشارەزایی پێویست بۆبەدەستهێنانی سەرکەوتن ، لەگۆڕەپانی شەڕ. لەبەر ئەمە ئەو چاودەبڕێتە مانۆڕ ، زیاتر لەهێزی ئاگر. مانۆڕیش لەوانەیە شێوازی دپلۆماسی و، ڕامیاری بگرێتەوە ، یان پیکهاتەی کوشتاری. هەرچەندە –سون تزو- پێی باشترە، سەرکردەی سەربازی دوژمنەکەی ببەزێنێ بێ ئەوەی پەنابباتە بەرشەڕ، بەلاٖم خۆیشی ئەمە بەمەحاڵ دەزانێ لەهەندی کاتدا.

تێڕوانینی –سون تزو- بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن بەبێ کوشتار، لەدوو خاڵدا خۆی دەبینێتەوە :-

یەکەم :ئامادەکردنی ژینگەیەکی ڕامیاری و، دبلۆماسی بەجۆرێك دوژمن شەڕەکەبدۆڕینێ، پێش دەست پێکردنی کوشتار.

دوهەم: بڵاوە پێکردنی هێزی سەربازی، بەشێوازێك کەسترتتیژی دوژمن بەلادا ببات. واتای قسەکەی : باشترین ڕامیاری سەربازی والەناو هێرش کردنە سەر ستراتیژیەکان، دواتر هێرشکردنە سەر هاوپە یمانێتیەکان ودواتریش هێرش بۆسەر سەربازەکان، خراپترینیان هێرش کردنە بۆ سەر شارە قایمکراوەکان. ئەو مانۆڕی ڕامیاری بەباشتر ئەزانێ.

لەجیگایەکی تردا دەڵێ: بەکارهێنانی هێزی سەربازی، گە نجینەی ولاٌت خاڵی ئەکاتەوە . قەبارەی سەرکەوتنەکە کەبەدەست دێت هەرچەندێك بێت.

هـــــەندێ ستراتیژی سەربازی لایەنـــــگری خۆتێخزان ئـەکات، لەفەرمانگەکانی دروست کردنی بڕیاری نەیارەکان ، لەکاتی بەڕپوەچونی جەنگ. بە پێی ووتەی–سون تزو- پێویستە هەوڵ بدەین ، بخزێینە ناو فەرمانگەکانی دبلۆماسی

دوژمن ،  بۆ دروەست کردنی بڕیار .  هەتاکو بەکورتی و پوختی،  خۆمان لەجەنگ لابدەین.  لەمەباشتر ،گەیشتنە بەعەقڵی دوژمن .  بەم ڕێگایە نەك هەرجڵەوی مانۆڕ ئەگرینە دەست،  بەڵکو ئەتوانین زاڵ بین بەسەر وەلآمدانەوەی دوژمنیش.  ئەگەر یەکێك لەم دووبژاردەمان بۆ نەکرا ، دەبێ بچینە ناو فەرمانگە ی دروست کردنی بڕیار لای دوژمن .  کەکردنی ئەمانە پپویستی بەهەوالگری باش هەیە ، باشتر وایە هەوالگری مرۆڤی بن.  چونکە هەوالگری ئاماژەو ، وێنەیی ئاسمانی ،  کەم کاراترن،

لایەنێك لـــــــە جیاوازیەیەکانی نێوان ئەو ستراتیژەی کە-سون تزو- گرتویەتیەبەر،  دژ لەگەڵ ئەو ستراتیژەی کەویلایەتە یەکگرتوەکان پەیرەوی دەکات.  دەتوانین بەجیاوازی نێوان هەردوو یاری –سیقا-ی ئاسیایی و-شەترەنج –بیانچوێنین .  ئەوا لەیاری –سیقا-دا یاریزان سەربازەکانی لەسەر تابلۆکە دائەنێ،  بۆ ئەوەی هەڵسوڕاندنی یاریەکە و،  دانانی سنورێك بۆ بژاردەکانی نەیارەکەی دابنێ.  نەیار هەندێ لەسەربازەکانی لەدەست ئەدا،  بەمەش یاریەکە ئەدۆڕێنێ،  بەهۆی بالادەستی بەرگر لەمانۆڕدا،  نەك لەهێرشی ڕاستەوخۆدا، بەلاٚم لەشەترەنج ئاما نجەکە گرتنی سەربازی سەرەکیە کە پاشایە ، ئەمەش زاڵ بوونی تەواوەتی دەوێ ،  کەنایاتەدی،  تەنها بەگرتنی سەربازەکانی دوژمن .  تاکو نەبنە هەڕەشە لەسەر پاشا ولەهەمان کاتدا پاشاش بپارێزن ..

وە-سون تزو- وای دەبینێ،  ئەو سەرکردانەی لەجەنگدا سەرئەکەون ،  بەبێ پەنا بردن بۆ کوشتار .  ناوبانگیان دەرناچێ وەك پیاوی زانا ،  یان ئازا .  وەنمونەی ئەو سەرکەوتنانە کە-سون تزو-بەباشی دەزانێت بیٚئەو غەڵبە غەڵبە ڕوئەدات کەزۆر جارلە سەرکەوتن لەجەنگدا دێتە ئاراوە،  کەلەوانەیە نەبوونی غەڵبەغەڵب و، نمایشی سەربازی ،  هۆکاری گرنگی سەرکەوتن بن .

بەم جۆرە- سون تزو- هەندێ ڕێگاو شێواز دەخاتە ڕوو کەڕەنگە دەوڵەتانی لاواز لێوەی سەرکەوتن بەدەست بهێنن بەسەر دەوڵەتانی بەهێز. دەبینین کەئێستا ویلایەتە یەکگرتوەکان دەوڵەتی هەرە بەهێزە بەلاٚم ڕوبەڕووی ئەم جۆرە ستراتیژانە دەبێتەوە کە-سون تزو- خستویەتیە ڕوو  لەو جەنگانە کەلەماوەکانی داهاتوودا دەیگێڕن .

(( سون تز )) و

## یاری یەجەنگیەکان

### کێ یەکەم جار یاری جەنگی کردووە؟

پرسیارێکە بەدیاری کراوی کەس ناتوانێت وەڵامی بداتەوە

بۆئەوەی داد پەروەر بین لەوەڵامدانەوەکەمان. بابڵێین کەیاری جەنگی ، پێش جەنگی سیستەمی کەوتووە. یاری شەترەنج ، یەکێکە لەیاری یە هەرەکۆن ومێژوویەکان ، کەهەزاران ساڵە مرۆڤ زانیویەتی. یاری شەترەنج ، بۆخۆشی و، فێربوون و، لێکچواندن بەکارهاتوە. سەرباری ئەمەش ، یاری دیکە ی هاوشێوەی شەترەنج هەیە، کەلەسەردەمی کۆندا دەرکەوتوە و، لەگشت سەردەمەکاندا بڵاوبوەتەوە . بەلاَم نهێنی مانەوەی یاری جەنگی ، وریابونەلەجەنگ ، زیاتر لەیاریەکانی دیکە. لەبەر ئەوەی یاریەکانی جەنگ گەشەی کردوە لەگەڵ گەشەکردنی جەنگ بەدرێژایی مێژوو، وەکو هەرشتێکی دیکەی ژیان هاوڕێی گەشەکردنی مرۆڤ وئەو دەوروبەرەیەتی کەتێیدا دەژی. هەتاکو سەرەتای سەدەی حەڤدەیەم ، کاتێ یاری جەنگیی نوێ دەرکەوت، کەزۆر ڕێکخراوترە لەڕووی ئامانج وهۆکارەکانی و........هتد

یاری جەنگی ، بەردەوام بوو لەگەشەکردن تاکوو سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم . تاکو بیرمەند و پیاوە سەربازیەکانی سوپای ڕوسیا ، هەستان بەئامادەکردنی یەکەم یاری جەنگی ڕاستە وایی- واقعی- پرۆردەکاری بۆ مەبەستی مەشق و، پلاندانان و، شی کردنەوەی ڕێگا چارەسەرەدانراوەکانی ئۆپەراسیۆنە سەربازیەکان.

میکانیزمی ئەو یاریە وانەخشەی کێشراوەو، ڕێساکانی دانراوە، لەسەربناغەی زانیاری و، توێژینەوەی ورد پشت ئەبەستێ بەهزر و، زانستی سەربازی ئەوکات. سەرەڕای ئەزمون وشارەزایی ڕاستەوایی، لەڕاستیدا سود وئە نجامەسەربازیەکانی بەشێوەیەکی ڕوون دەرکەوت .

لەم دەست پێکردنە مێژووییەوە بۆ بایەخەکەی ، زۆرێك لەسوپاکان گرنگیان پێدا ، کە پاشتر ئەڵمانەکان بەیەکەم دائەنرێن ، کەیاری یە جەنگییەکانیان بەڕاستیەوە خستە ناو ئیشەکانیان . وەیەکەم کەس بوون سودیان لەئە نجامەکانی وەرگرت لەڕووی زانستی وکرداریدا لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەم . لەهەمان ماوەی مێژوویی، هەندی کتێب دەرکەوتن، کە پەیوەستن بەیاری یە جەنگی یەکانەوە و، بایەخیان دەرئەخات. وەیاری یەجەنگی یەکان بەردەوام بوو لەگەشەکردنی پلەبە پلەی خۆی. هەتاکو جەنگی دوەمی جیهانی .گەشەکردن وبایەخی یاری جەنگی گەیشتە ڕادەیەك کەیاری جەنگی ڕێیەکی تری گرت، کەبایەخی ئاما نجەکەی کەمتر نیە لە لەبایەخی یاریە جەنگیەکان لە مەشق وفێرکردن .

ئەم ڕێگا نوێیە، سەرەتای دەست پێکردنی بەکارهێنانی یاری جەنگی بوو لەئاراستەی زانستی . بەدیاری کراوی لەتوێژینەوەو شیکاریەکان ، وای لێهات یاری جەنگی بۆ پێشەوە بڕوات ، بەدوو ئاراستەی هاوتەریب یەکێکیان مێژوویی و، ئەوی تریان زانستی .

پاشتر ئاراستەی زانستی (شیکاری) لەیاری جەنگی زاڵ بوو بەسەر ئاراستەی مێژوویی، هەروەك یاریەکانی پێشتر، کەیاری جەنگی ئیتر دەڕوانێتە داهاتوو، وە لەسەری دەوەستێ، زیاتر لەوەی بڕوانێتە ڕابوردوو .

وەلە پاش جەنگی دوەمی جیهانی ولەکاتی جەنگی سارد دا، ئەمریکی یەکان هەستان بە نەخشەسازی و پەیڕەو کردنی یاریە جەنگی یەکان، لەسەر ئاستی ستراتیژی . لەجیاتی ئەو یاریە کۆنانەی کەئامانج وچوارچێوەی سنوردارە.
وەبیرۆکەکە لەم دەست پێکەوە دەستی کرد بە پۆلێن و بایەخی زیادی کرد. مۆرکی ڕاستەوایی وەرگرت ، لەهەموو شتێك کەلەچواردەوریەتی . شێوەو بەرهەم هێنانی زیادی کرد. کە پاشتر لەشەستەکانی سەدەی بیستەم ، شوێنی خۆی گرت ولەڕووی بازرگانیشەوە بلاوبووەوە.

وەبەدەرکەوتنی تەکنەلۆژیای کۆمپیوتەر بەدیاری کراوی لەحەفتاکاندا ،کۆمپیوتەر کەوتە ناو بواری یاریە جەنگیەکانەوە ، وەیاری جەنگی دەستی کەم بوەوە ، بەبەکارهێنانی کۆمپیوتەر لەبواری یاریەجەنگیەکان ، ئەم بازدانە بەسەرەتای ( سەردەمی زێڕین ) ی یاری یە جەنگی یەکان دائەنرێت . بایەخی زیادی کرد . هەروەها خێرایی بلاْوبونەوەشی زیادی کرد. بەهاتنە ناوەوەی کۆمپیوتەری کەسی بۆ گۆڕەپانەکە ، لەم خاڵەشەوە گەشەکردنی یارییەجەنگی یەکان بەسترایەوە بەگەشەی کۆمپیوتەرەوە . کە پاشتر ڕاستەوایی ووردەکاری لە چونە ناوەکان و، چونەدەرەوەکان و، ئە نجامەکانیش گەشەی کرد.
کۆمپانیا پەیوەندارەکان دەستیان بە پێشبڕکێ کرد لە پیشەسازی و بەرهەمهێنانی یاریە جەنگی یەکان . هەتا وای لێهات کەیاریە جەنگی یەکان بگاتە ئاستی نیمچە تەواوەتی لەکارکردنی و لەسودەکانی . هەروەها تەکنیکی بازرگانی یاریە جەنگی یەکان، چوە ناو بواری دیکەی ژیانەوە. ئێستا سیستەمی لەیەکچواندن لەگشت بوارەکانی ژیان بەشێوەیەك لەشێوەکانی یاری جەنگی دادەنرێت ، کەلایەن وبوارەکانی ژیان دەست بەرداری نابێت لەبواری فێرکردن و، مەشق و، شیکاری ووێناکردنی داهاتووی ژیان .

يارييه جەنگيەكان وەك هەر ياريەكى ديكە وايە. كەدوو لا، يان زياتر كێبڕكێى تێدا دەكەن بۆ بردنەوەى ئەنجامى ياريەكە(٤) . ڕەنگە ياريەكە بۆ خۆشى، يان بۆ بەدەست هێنانى شارەزايى، يان زانينى شتێك ، يان سەلماندنى ئەزمونێك بێت . بەدەر لەمەبەستەكانى ياريەكە ، بيرۆكەى ياريەجەنگيەكان بابەتێكى ترە و بەشێوەيەكى گشتى واتا ، پێكهاتەكانى ياريەكەو، ڕێگاكانى يارى كردن .

لەگەڵ ئەوەدا كەڕێگاو شێوازى يارى كردن جۆراوجۆر بووە ، بەلاّم يەك بيرۆكەيە، كورت دەبێتەوە لەساكارترين شێوەى ياريەكان لەگۆڕەپانێك ، يان لەسەر تابلۆيەك، يان ناوچەيەكى ديارى كراوبۆيارى، يان لەسەر نەخشە دەكرێت، ئەوسا ناوچەكە كەياريەكەى لەسەر دەكرێت دابەش ئەكرێت بەسەر چەندين بەشى جياوازدا بە پێى پێويست و سروشتى ياريەكە ، ئەم بەشە ديارى كراوانە جوڵەى دژبەيەكى هەردوولاى لەسەر دەكرێت ، كەلەسەر نمونەى هێماو شێوەيە ، كە پێى ئاشنان لەناوچەيەكى ديارى كراوەوە دەست پێدەكات بەئاراستەى ئامانجەكانى ،هەموو ئەمانەش هەر لەدابەش كردن و، جولاّنەوەكان و، هێماو، شوێنەكان بە پێى ڕێسايەكى ڕوون ئەنجام ئەدرێ ، كە پەيڕەو و ياساى دياريكراو كۆنترۆڵى ئەكات .

سەبارەت بەئێمە ، لەتێڕوانينى سەربازيەوە كاتێ ئەوەى سەرەوە وەردەگێڕين . ئەبينين كە ( ڕووبەرى ياريەكان ) گۆڕەپانى كوشتار و، سروشتى ئەو زەويەيە كەئۆپەراسيۆنەكانى لەسەر دەكرێت. وەبەشەكان ئەو ناوچانە دەنوێنێ، كەهەر لايەك زاڵە بەسەريدا، وەهێماكان يەكەسەربازيەكان دەنوێنێ ، وجولاّندنەكان مانۆڕەكان دەنوێنێ ، و و ياساو ڕێساكانى ياريەكە، ڕەنگدانەوەى باوەڕە سەربازيەكانە ، ئەنجامەكانيش لەسەر ئەزمون و، شارەزايى و، ئەنجامى شەڕەكانى پێشوو بنيات نراوە......هتد

وە ساكارترين نمونەش كەبەهۆيەوە ياريە جەنگيەكا نمان بەخەياڵدا بێنێت يارى( شەترەنج ) ە، كەشێوەيەك لەشێوەكانى يارى يەجەنگيەكانى يەكەممان بۆ دەنوێنێ ، كەنەخشە بۆ كێشراو وبەكارهێنراوە بۆ مەبەستێكى ديارى كراو بە پێى ياساو ڕێسايەكى ڕوون وجێگير .

---

٤ ـ يارى

دامە( داوە )ى كوردەوارى خۆمان بەيارى جەنگى دادەنرێت كە پێويستى بە پلان دانان هەيە بۆ جولاّندنى سەربازەكان تادەبنە ئاغا( كەدەسەلاّت وتواناى زۆرترى هەيە ) وەبەكوشتنى گشت سەربازەكان كۆتايى بەياريەكە دێت ئەم ياريە پێ دەچێت لەقۆناغى دەرەبەگايەتى لەكوردستاندا بلاّو بوبێتەوە وهەتاكو ئێستا لە ناو پيرو بەسالاّچوانى كوردستان يارى دەكرێت وبەرەو لەناچوون دەچێت ،

گرنگترین خاڵ کەدەبێ بیزانین ، یاریەجەنگیەکان بەگشت شێوەو ، جۆر و، مەبەستی جیاواز و بەکارهێنانەکانی ، سەرەتاو کۆتاییەکی ڕوون ودیاری هەیە . بنیات نراوە لەسەر شارەزایی پێشتر و. ئاراستە کراوە بۆ مەبەستێکی دیاری کراو لەیاری کردن. بەتێڕوانین لەمێژووی درێژی یاریە جەنگی یەکان ، چەمك و پێناسەی یاری جەنگی لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەك و، لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر زیادی کردوە . بەلاَم سەرەڕای ئەمەش سەرجەم ئەو چەمك و پێناسانە لەیەك خاڵدا کۆتاییان دێت . کەدەتوانین لەیەك ڕستەدا پوختی بکەینەوە. کەسادەو ڕوون و گشتگیر بێت وئێستا وڕابوردوو کۆبکاتەوە ، ئەوە یە کە ، یاریە جەنگی یەکان بریتی یە لە : (( هەوڵەکانی بازدان بۆ داهاتوو بە تێگەیشتنی ڕابوردوو )) وەلەم چەمکە سادەیەوە تێدەگەین کەیاریە جەنگیەکان لەهاوپێچیدا زانست وهونەر کۆدەکاتەوە، کەبەبێ ئەم دوانە ناتوانین یاری جەنگی بکەین ونەخشەسازی بۆ بکەین یان سودی لێ ببینین.

وەیاری یە جەنگیەکان بەتێڕوانینی سەربازی واناسراوە کەبریتی یە لە : (( لێکچواندنی ئۆپەراسیۆنی سەربازی ڕاستەقینە ، یان گریمانەیی دوولایەن ، یان زیاتری دژبەیەك بە پێی یاسا وزانیاری دیاری کراو. وەیاری کردن بە پێی چەند پەیڕەوێکی دیاری کراو )) .

هەروەها یاریە جەنگیەکان ناسراوەبە وەی کەبریتی یەلە : (( جۆرێك لەجەنگی لێکچوو کەبەبێ هێزی سەربازی ڕاستەقینە ئە نجام ئەدرێت، کە ڕوداوەکانی پشت دەبەستێ بەبڕیارەکانی لایەنەکانی ملاملانێ ))

هەروەها ناسراوە بەوەی کەبریتی یەلە : (( نواندنی هەڵوێستێکی دیاری کراو بە پێی ڕێساو پەیڕەوی دیاری کراو بۆهەردوولا ، یان زیاترکەبنیات نراوە لەسەرپەیڕەو وڕێساو زانیاری )) هەروەها ناسراوە بەوەی کەبریتی یەلە(( لێکچواندنی شەڕێك یان هەڵمەتێك بۆ نرخاندنی هزری سەربازی وچۆنیەتی جێبەجێکردنی )).

بەلاَم چەمکی یاریەجەنگیەکان ئەخولێتەوە بەدەوری (( ئەزمونکاری بۆ چاك کردنی جۆری بڕیارەکانی مرۆڤ لەهەڵوێستێکی دیاری کراو لەلێکچواندن و، جێبەجێ کردن و، بەڕێوەبردنی لەسەر ڕیسای زانستی ))وەلەو خاڵە گرنگانەی کە دەبێ ڕەچاوی بکەین لەکاتی ورد بونەوەلە پێناسەی یاریەجەنگیەکان ولێتێگەیشتنێك کەدەبێت جیاکاری بکەین لەنێوان زاراوە سەربازیەکان وسیستەمەکانی دیکە ، کەهاوشێوەو هاوبەشە لەکارو بەکارهێنانەکانی یاریە جەنگیەکان. لەو سیستەمانە ئەوەی کە پێی دەڵێن سیستەمی ڕواڵەت – simulation systems–کەبریتی یە(( لە لێکچواندنی سیستەمێکی تەواوی دیاریکراو بەسیستەمێکی دیکە ، کەهاوشێوەی سیستەمە بنچینەییەکە کاربکات ))وەکو سیستەمی ڕواڵەتی کوشتار کە قسەی لەسەر ئەکەین. لەبەشی کۆتایی ئەم وتارە. هەروەها زاراوەی مۆدیل – modils–کەبریتی یەلە(( نواندنی سیستەمێکی دیاریکراویان هەڵوێستێکی دیاری کراو بەسیستەمێکی دیکەکەبتوانێ سیستەمی بنچینەیی بنوێنێ )) وەکو لێکچواندنی سیستەمی هەواڵگری یان سیستەمی پشتیوانی بەڕێوەبردن....هتد

لەبەر ئەمە نمونەکان لەکۆ گشتی یەکەی زۆر جار سیستەمێکی لێکچواندنی تەواوکراوە کەدواتر بەکارهێنەر ئەتوانی یاری جەنگی بکات لەسەر سیستەمی ڕواڵەت ، لەدەرئە نجامی ئەمەش یاریە جەنگیەکان بە ڕواڵەت دائەنرێ ، بەڵام سیستەمی ڕواڵەت بەیاری جەنگی دانانرێت

وەنابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە پێی دەڵێن –لاسایی کردنەوەکان-simulators-کەبەکاردێت بۆلەیەکچونی ماشێن و، چەك و، ئامێرەکان . وە بەکاردێن بۆفێرکردن و، ڕاهێنان لەسەر ئاستی تاك و دەستە. وەبیرۆکەی ئەم لاسایی کردنەوانە ئەکەوێتە ژێر چەتری سیستەمی ڕواڵەت . هەروەها لەمەوە دەگەینە ئەو دەرئە نجامەی کەچەمکی ڕواڵەت فراوانتر وگشتگیر ترە لەچەمکی لاسایی کردنەوە کەمەبەستی لیکچواندنی سیستەمێکی دیاری کراوە.

## مێژووی یاریە جەنگی یەکان.

لەسەرەتادا وادەرئەکەوێ ، زاراوەی – یاریە جەنگیەکان – تازە بێت ، بەڵام لەڕاستیدا لەبیرۆکەو بەکارهێنان وکردنی دێرینە، ئەگەردوای ڕەگی یاریە جەنگیەکان بکەوین . ئەوا چەندین ڕێگا ئەگرینە بەر کەنەسەرەتای هەیە ونەکۆتایی . چونکە بە وردی نازانرێت لەکەیەوە و، لەکوێ و، ،بۆچی یاری جەنگی دەستی پێ کرد؟ ئەمە سەرەڕای ئەوەی ڕەنگە هەندێ ڕێگا ، بمانباتە سەردەمانێکی ڕابوردوو کەسەلماندی هاوسەردەمەکانی یاری جەنگیان کردوە. کەمێژوو تۆماری کردوە ، چینیەکان لەسەردەمی کۆنەوە یاری جەنگی یان کردوە. ئەمەش بەنزیکی ( ٥٠٠٠ ) ساڵ پێش زاینی. ئەمەش ئەو ماوەیەیە ، بیرمەندی سەربازی ستراتیژی چینی- سون تزو- تێیدا ژیاوە. کەهەندێ لەباوەڕەکانی سەربازی و، سەرەتاکانی جەنگ و، زانستەکانی و، هونەرەکانی ئەوکاتەی نوسیوەتەوە.

مێژوو ئەوەی نوسیوە ، چینی یەکان ( ( یاری یەجەنگی یەکان ) )یان دەکرد لەسەرتابلۆی تایبەت. بەوە کەبەردی ڕەنگاوڕەنگیان بەکاردەهێناکەدوولای ناکۆکی دەنواند، وەلەیاریەکەدا ستراتیژو، هونەری جیاوازی جەنگ جێبەجێ دەکرێت، بەئاما نجی گەمارۆدانی نەیار. وەسەرکردە سەربازیەکان یاری جەنگی یان بەکاردەهێنا بۆ پێداچونەوە و، لێکدانەوەی پلانەکانیان، بۆ هەڵمەتە سەربازیەکانیان . هەروەها مێژووی سەربازی لەماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی تر، ئەم جۆرە بەکارهێنانە سەربازیانەی یاریەجەنگی یەکانی دەنوسیەوە. لەهەریەك لەهند ویۆنان ومیسرو هی تر .

سەرەڕای ئەم گرنگی یەی یاری یەجەنگی یەکان ، بەڵام لەڕووی سەربازیەوە بەو شێوەیەی وێنای دەکەین بلاو نەبووەوە. هەتاکو سەدەی حەڤدەی زاینی . ئەمەش کاتێك دەستی بە ڕاستی وەرگرتن و ، گرنگی پێدان کرد، زیاد لە پێشووتر ، هاوشانی دەرکەوتنی ڕێکخستنی سەربازی زیاتر ڕێکخراو و پیشەیی . پاشتر یاریە جەنگی یەکان نەخشەسازی و، بەکارهێنانی بەشێوەیەکی وردتر و، ڕاستەوایی تری بۆکرا. کەهەستان بەوێنەگرتنی سروشتی زەوی و، نواندنی لەسەرمێزی یاری ، بەشێوەیەکی ورد و، ڕێژەیی پێوانەی وێنەکە. لەمەوە یاری یەجەنگی یەکان بەردەوام بوو لەگەشەکردن. پلەبە پلە هەتا وای لیهات پێگەی خۆی هەبێت لەزانست و، هزری سەربازی ئەو کاتە. تاکو ئاستێك کە چوە ناو بەرنامەی

فێرکردن لەکۆلێژە سەربازی یەکان، وە شوێن وکەرەستەی تایبەتی بۆ ئامادەکرا، .وەك کەرەستەی فێرکاری کەلەسەر شێوەی مێزی لم دەرکەوێ کەلەسەر پێوانەی وێنەیەك بنیات نراوە . ڕەنگدانەوەی سروشتی زەوی و ، قەبارەی هێزەکان و، جۆری تەکتیکی پەیڕەوکراوی ئەوکاتە دەنوێنێ. ئەم ماوەیە بەبەردی بناغەی یاری جەنگی نوێ دادەنرێت. لەبەر ئەمە هەندێ لایان وایە ئەمە یەکەم پەیدابوونی یاری یەجەنگی یەکانە.

هەروەها ئەڵمانەکان و، ئەوانی دیکەش کەبەشداررببوون لەجەنگی یەکەمی جیهانی ، یاریە جەنگی یەکانیان بەکارئەهێنا . وەك هۆکارێك بۆ چاك کردنی جۆری بڕیارەکانی سەرکردایەتی یە جیاوازەکان ، بەتایبەتی سەرکردایەتی بالاَ کان تیایدا. لە هەمان ماوەدا ژاپۆنیەکان بۆ هەمان مەبەست بەکاریان هێنا لەکۆلێژی سەربازی پەیڕەویان دەکرد. هەروەها دەریاوانی ئەمریکی ڕۆڵی گەورەیان هەبوو لەگەشەکردنی یارییە جەنگی یەکان . کەدەریاوانی ئەمریکی ناوبانگی بەدەست هێنا لەئەنجامی گرنگیدان بەیاریە جەنگی یەکان وگەشە پێدانی. تائاستێك کەسەرکردایەتی بالاَ لەئەمریکا پشتی پێ دەبەست ، وەك هۆکارێك بۆ گەیشتن بەباشترین بڕیارەڕامیاریەکان . بۆ ئەو هەڵوێست و گریمانانەی کەدەیخەنە ڕوو. ولەئەنجامی ئەم بایەخە مێژوویەی ، یاری یە جەنگی یەکان بوەتە ئامڕازێکی گرنگ لەگشت سەردەمەکان . وەماوەیەك بۆ ماوەیەکی تر بایەخی زیادی کردووە. هەتا گەیشتە ئەوەی لەگشت بوارەکاندا لەئێستادا گرنگی پێ بدرێت . بەتایبەتی لەبواری سەربازی دا لەگشت ئاستەکاندا ، هێشتا ڕۆژ بە ڕۆژ بایەخی زیاترئەبێت. هەتا پێشکەوتنی تەکنەلۆژی زیاد بکات و، سروشتی جەنگ وئامڕازەکانی گەشەبکات . بەڵگەش لەسەر ئەمە لەبەکارهێنان وبلاَوبونەوەی یاریە جەنگی یەکان ڕوونە لەئەنجامی پێشکەوتن وبلاَوبونەوەی زانستی کۆمپیوتەر، ڕێڕەوی مێژوویی یاری یەجەنگی یەکانی لەیاری دەستی یەوە گۆڕی بۆ یاری ئەلکترۆنی. ئەمەش لەلای خۆیەوە لەبایەخ و شێوە و، پێداویستی یەکانی و، بەکارهێنانەکانی زیاتر کرد. ئەبێ لەیادمان نەچێ ، ئەوەی کەئەمڕۆ دەبیینین لەیاری یەجەنگییەکانی تایبەت و، بازرگانی وهی تر،،هەر درێژکراوەی یاری یەجەنگی یەدەستی یەکانە کەبەیاری کردن لەسەر تابلۆی سادە، یان لەسەرلم و هی تر دەستی پێ کرد . وە بەکۆمپیوتەر کۆتایی پێهات. سەرەڕای پێشکەوتنی تەکتەلۆژیا ، کەئەمڕۆ زانست پێی گەیشتوە ، هێشتا سێ جۆری یاری یەجەنگی یەکان بەکاردێت . بریتی یە لەیاری کردن لەسەر تابلۆی تایبەت بەیاریەکە ، وەیان لەسەر لم و، یان لەسەر کۆمپیوتەر.

دیارترین دیاردەی مێژوویی یاری یە جەنگی یەکان کەباسمان کرد . کورت ئەکرێتەوە لەمانەی خوارەوە :-

أ-بیرۆکەی یاری یەجەنگی یەکان ، ئەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەکی درێژی پێش زایین. باسی ئەوە دەکرێ کەبیرمەندی ستراتیژی چینی –سون تزو- لەسەرتابلۆیەکی تایبەت ، بەردی ڕەنگینی لەسەر بوو یاری دەکرد . کەهێزی هەردوولای دەنواند. کەهەرلایەك هەوڵی گەمارۆدانی ئەوی تری ئەدا . بەکارهێنانی ئەم جۆرە یاری یە، لەو کاتە بلاَوبوەوە لەهەندێ ولاَت، وەکو: هند و، یۆنان و، میسر و، ولاَتانی تر ی سەردەمی کۆن .

ب –بایەخی یاری یەجەنگیەکان بەردەوام بوو ، بەبەستنەوەی بەبواری جەنگی یەوە، وە بەشێوەیەکی تایبەت پێش دەکەوت ودوائەکەوت لەگەڵیدا، تاکو سەدەی حەڤدەیەم.

**پ- لەساڵی ١٦٤٤ز ، لەئەڵمانیا یاری پاشاکان(( شەترەنجی پێشکەوتوو ))دەرکەوت . کەبە پێی چەند جوڵەیەك یاری ئەکرێ کە ژمارەی -١٤- جوڵەیەو، پێکهاتوە لە : ٣٠ پارچە بۆ هەرلایەك ، کەهێزی سەربازی دەنوێنێ وەدواتر ناونرا شەترەنجی سەربازی.**

**ت- ساڵی ١٧٨٠، یاری یەکی جەنگی دەرکەوت پێشکەوتووتر لەوەی پێشوو، کە پێکهاتوە لە : ١٦٦٦ چوارگۆشە و،١١٨ پارچە، کەهێزەکان دەنوینی و، چوارگۆشەکان بەجۆرێك دابەش کراون کەشەش جۆری زەوی دەنوێنێ ، کەبە پێی یاسا وڕێسایەکی دیاری کراو یاری دەکرێ. ئەم یاری یە لەفەرەنسا و، ئیتالیاو، نەمسا وئەڵمانیا و، وڵاتانی دیکەی ئەوروپا بڵاوبووەوە.**

**ج- لەساڵی ١٧٨٩، ئەڵمانیا یاری یە جەنگی یە کۆنەکانی گەشە پێدا بۆ (( ٣٦٠٠ )) چوارگۆشە، کەسنوری بەلجیکاو، فەرەنسای دەنواند ، کەبەیاسا وهەندێ کرداری زۆر ورد یاری ئەکرا.**

**چ- ساڵ ١٨١١، ئەفسەرێکی بروسی (( فون ڕیسیفیتز ))گەشەی بەیاریە جەنگیەکاندا ، لەسەر تابلۆوە بۆسەرمێزی لمین. کەبەتەواوی سروشتی زەوی بنوێنێ، وە بە پێوەری وێنەکە دروست کراوە کەیاسا وڕێسای وردی بۆدانا . سەرباری وەرگرتن و، ڕەچاوکردنی هۆکارەکانی کەش وهەوا و، هێز وتوانای هێزەکان و، چەك وکەرەستەکان ، ئەمەش بناغەیەکی نوێی بەهێزە بۆ یاریە جەنگی یە نوێیەکان.**

**ح-ساڵی١٨٢٤، یاریە جەنگی یەکان ، گەشەیان پێدرا .بۆسەرنەخشە، کە بە پێوەری وێنە دروست کراوە. ئەمەش سەرەتایەکی ڕاستەقینە بوو بۆیاری یە جەنگی یە وشکانییە نوێکان . چونکە ڕۆڵی توخمەکانی پشتیوانی شەڕی دەرخست. ، بەشێوەیەکی زۆر ڕونتر.**

**ح –ساڵی١٨٧٦، یاری یە جەنگی یەکان گەشەی کرد بۆ یاری یە ئازادەکان(( پشت بەیاریزانەکان دەبەستێ ))، لەجیاتی یاسای جوڵە جێگیرەکان .**

**د-ساڵی ١٨٧٦ ، یەکەم یاری جەنگی دەریایی دەرکەوت (( کەئەفسەرێکی ئینگلیزی ))دیزاینی بۆ کردبوو**

**ر-لەساڵی ١٨٧٩ ، یاری یە جەنگی یەکان چووە ناو ولاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکاوە.**

**ز-ساڵی ١٨٨٠، یاری جەنگی ئەمریکی –**strategos**–ستراتیگۆز-ی ئەمریکی دەرکەوت .**

**ژ-لەگەڵ سەرەتای سەدەی بیستەم، بەشێوەیەکی بەرچاو بەکارهێنانی سەربازیانەی یاریەکان فراوان بووەوە لەئەوروپا وئەمریکا،وەبەشێوەیەکی گشتی چووەناو گشت ڕێکخستنە سەربازیەکان و، دامەزراوە فێرکاریەکان بەشێوەیەکی تایبەت.**

**س-لە پێشداو لەکاتی هەردوو جەنگی جیهانی، ئەڵمانیا بەشێوەیەکی فراوان یاریەجەنگی یەکانی بەکـــارهێنا. لـــەئاستە جیاوازەکان بۆ چاك کردنی جۆری بڕیارەکانیان . بەتایبەتی لەسەر ئاستی باڵادا.**

**ش-لەکاتی هەردوو جەنگی جیهانی، ژاپۆنیەکان یاریە جەنگی یەکانیان بەشێوەیەکی گەورە بەکارهێنا ، بەڵام لەنرخاندنی ئەنجامی لێدانی بەندەری ( بێرل هاربەر ) دا خراپ بەکاریان هێنا و باش ئەنجامەکەیان لێك نەدابووەوە و**

کەبووە لێدانێکی جەرگبڕ بۆیان.

ع-گشت دەوڵەتانی ئەوروپی و، وڵاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا و، دەوڵەتانی بەشدار لەهەردوو جەنگی جیهانی بەشێوەیەکی جدی یاریەجەنگیەکانیان بەکارهێنا. کەڕۆڵێکی دیاری هەبوو لەجۆری بڕیاردان لەئاستە جیاوازەکاندا.

غ-لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانی وشەڕی سارد، ڕێڕەویێکی زانستی تازە دەرکەوت بۆ یاریە جەنگی یەکان لەبەکارهێنانی بۆ مەبەستی شیکاری.

ف-لەحەفتاکانی سەدەی بیستەم وهەتاکو ئەمڕۆش، یاریەجەنگی یەکان دەستی بەبڵاوکردنەوە و، بەکارهێنان کردلەسەرجەم بوارەکان، بەشێوەیەك کەوێنەی نەبووە. وەپشتی پێدەبەسترێت بەڕادەیەکی زۆر لەچاك کردنی بڕیارەکان.

## پێکهاتەکانی یاری یە جەنگی یەکان:

ئەتوانین لەڕوانگەی سەربازی یەوە، وێنای یاری یە جەنگی یەکان بکەین. وەك نەخشەیەك کە هێماو ئاماژەکانی لەسەر دانراوە ، یەکە سەربازیەکانی هەروولا دەنوێنێ. وەهەردولا ڕکابەری ئەکەن بە پێی یاسا و، ڕێساو، کرداری دیاری کراو کەبنیات نراوە لەسەر زانست و، شارەزایی کەیاریەکەش سنور و، سەرەتا و، کۆتایی بۆ دیاری کراوە.

بۆ کردنی یاریە جەنگی یەکان بەگشت جۆرەکانیەوە پێویستە ئەم پێداویستی و، سەرچاوانەی خوارەوە دابین بکرێ:-

ا-ئامانج.

ب-گریمانە(( ئەو هەڵوێستەی حەز بەلاسایی کردنەوەی دەکەین ))

پ-زانیاری پێویست ، بۆ بەشدار بووان.(( بۆ هەرلایەك لەیاریەکە ))

ت- نمونە(( جۆری ئەو یاری یەی حەز بەکردنی دەکەین ))

ج-یاساکانی یاری یەکەو، هۆکارەکانی زاڵ بوونی پێویست.

چ- پەیڕەوەکانی یاریەکە.

ح-یاریزانەکان (( ژمارەی لایەنەکان و، ژمارەی بەشداربووی هەرلایەك ))

خ-میکانیزمی تۆمارکردن و، شیکاریەکانی وانە بەسودەکان.

د-چۆنیەتی کۆتایی.

## جیاوازی یە بنەڕەتی یەکانی ، نێوان یاری یە جەنگی یەکان:

جیاوازیە بنەڕەتیەکانی نێوان یاریە جەنگی یەکان ، سەرچاوە بنچینەییەکانی یاری یە جەنگی یەکان دەنوێنیٚ کەلەمانەی خوارەوە کورت دەبێتەوە. :-

ا-جۆری یاریەکە(( دەستی ، ئەلیکترۆنی ))

ب-توانای بەشداری کردنی چەند لایەن لەیاریەکە(( لایەنێك، یان زیاتر ))

پ-شێوازی یاری یەکە(( ئازاد ، پابەند ))

ت-چەندی زانیاری و، جۆری زانیاری بەردەست لەیاری یەکەو ، ئاستی وردی زانیاریەکان (( کراوەیە ،سنوردارە )).

## پۆلێن کردنی یاری یە جەنگی یەکان لەڕووی بەشداربووەکان:

ا-یەك لایەن(( لایەنەکەی دیکە کۆمپیوتەر دەینوێنیٚ، یان دەستەی بەڕێوەبردنی یاری یەکە ))

ب-جووت لایەن(( ڕوداوەکان پشت دەبەستیٚ بەکارلێکی بڕیارەکانی هەردولا ))

پ- چەندین لایەن(( ستراتیژی ، یان ئۆپەراسیۆنی ، وە زۆر جار ڕامیاری یە ))

تەوەری یاریە جەنگییەکان ئەخولێێتەوە، بەدەوری کارلێکی بڕیارەکانی کەسانی پەیوەندی دار لەهەردولا ، یان زیاتر. کەڕوداوەکانی یاریەکە بەرهەم دێنیٚ . لەبەرئەمە یاری یە جەنگی یەکان لەڕوی سەربازی یەوە بەکاردێت وەك ئامڕازێك بۆ زانینی میکانیزمی جەنگ ، یان کوشتار و، هۆکارێك بۆ پرسیارکردن کەبەشیکاری ڕوداوەکانی یاری یەکە وەلاٚم ئەدرێتەوە . ئەمەش یارمەتی سەرکردەو ئەرکانەکان ئەدات، لەدروست کردنی بڕیارە سەربازیەکان بۆ هەلوێستێکی دیاریکراو کەلەڕاستەقینەدا لەسەر زەوی زەحمەتە بکریٚ، وەتاقی بکرێتەوە لەکاتی ئاشتی دا. ئەمەش واتا یاری یە جەنگی یەکان بەکاردێت وەك هۆکارێك بۆ گۆڕینەوەی ڕاو بۆچونەکانیش . وەبۆ چاك کردنی جۆری بڕیارەکانی کۆتایی سەبارەت بەهەلوێستێکی دیاری کراو . بۆیە پێویستە لەسەر بەشداربووان ئەوە بزانن کە بڕیارەکانیان تەوەری یاری کردنەکەیە. لەبەر ئەمە پێویستە ئامادەی یاری کردن بن بەشێوەیەکی ئاشتییانە و ڕاستەقینە . تاکو بگەنە بڕیارگەلێکی دروست ، لەگەلٚ جەخت کردنەوە کەمەیلی ئە نجامی یاریەکە نەبین بەبیٚ شیکارێکی ورد ، وەك ڕاستییەکی بڕوا پێهێنراو . وەپێویستە بەتەواوی ڕەچاوی دوورکەوتنەوە بین ، لەئاراستەکردنی یاریەکە بۆ گەیشتن بەئە نجامێکی دیاری کراو. چونکە مەبەست لەیاری یە جەنگی یەکان ، بەدەست هێنانی شارەزایی و، زانیاری ئایندەیە پێش بەڕاستی جێبەجیٚ کردنی . لەبەر ئەمە بوارەکانی بەکارهێنانی یاری یە جەنگی یەکان، چڕ دەکرێتەوە لەمانەی خوارەوە:-

ا-مەشق(( دروست کردنی بڕیارەکان ))لەئاستە جیاوازەکان.

ب- پلاندانان(( دارشتنی پلان ))لەئاستە جیاوازەکان.

پ-توێژینەوەکان(( خوێندنەوەی پێداویستیەکانی ئایندە و، سیستەمی چەکەکانی ئایندە ))لەئاستە جیاوازەکان.

ت-ڕابواردن (( بۆ بەدەستهێنانی شارەزایی – كێبڕكێ- بۆگەشەكردنی لێهاتوویی كەسەكان ))

## جۆرەكانی یاری یە جەنگی یەكان ، لەتێڕوانینی سەربازی یەوە:-

ا-یاری یە جەنگی یەكانی تایبەت بەمەشق ، كەنەخشەسازی بۆ دەكرێت لەسەربنچینەیەك كەیارمەتی بەكارهێنەری بدات كەوێنای زنجیرە هەڵوێستە یەك لەدوای یەكەكان بكات كەلەكاتی جەنگدا ڕوودەدەن . وە گەشە بە لێهاتوویان بكات ، لەبوارەكانی سەركردایەتی و، زاڵ بوون.

ب- یاری یە جەنگی یەكانی تایبەت بەئۆپەراسیۆنەكان . كەنەخشەسازی ئەمجۆرە دەكرێت، لەسەربنچینەی دابین كردنی توانا، بۆ تاقیكردنەوەو ، نرخاندنی ڕادەی گونجاوی پلانە سەربازیە پێشنیاركراوەكان وپێشكەشكراوەكان .

پ-یاری یەجەنگی یەكانی تایبەت بەتوێژینەوەكان. ئەمجۆرە یاری یە جەنگی یانە ، بەشێوەیەك دروست ئەكرێ. بۆ خوێندنەوەی بابەتە ئایندەیی یەكان ، چ جای هەڵوێست بێت ، یان سیستەمی دیاریكراوبێت ، یان پێچەوانەكەی.

## ئاستەكانی یاریە جەنگی یەكان:-

بەكارهێنەر ئەتوانێت لەچەندین لاوە بڕوانێتە جەنگ . سەبارەت بەئێمەی سەربازیش، ئەتوانین یاری جەنگی دابەش بكەین، بەگوێرەی ئاستەكانی ، بەم جۆرە:

ا-یاری یەجەنگی یەكان لە ئاستی ستراتیژی. ((لەسەرئاستی دەوڵەت)) ئەم ئاستەی یاری یە جەنگی یەكان نەخشەسازی بۆ ئەكرێت و، جێبەجێ ئەكرێت. بۆ یارمەتی بڕیار دروست كەرانی ئاستی باڵا لەدەوڵەت، بۆ وەرگرتنی باشترین بڕیار، بۆ بەكارهێنانی ئامڕازەكانی هێزی نیشتمانی، بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە نیشتمانیەكان و، چاودێری كردنی بەرژەوەندیەكانی دەوڵەت. لەو ئامڕازە نیشتمانیەش، هێزی سەربازی یە.

ب-یاری یە جەنگی یەكان لەئاستی ئۆپەراسیۆنی، (( لەسەرئاستی شانۆ)) نەخشەسازی بۆ دەكرێت بۆ خزمەت كردنی سەركردایەتی یە هاوبەشەكان ، كەیارمەتی یان بدات لە وەرگرتنی باشترین بڕیارە پێویستەكان، تاكو ئامڕازی سەربازی بەكار بهێنرێت وەك ئامڕازێكی هێزی نیشتمانی كاریگەر، بۆ بەدەست هێنانی ئامانجی ستراتیژی سەربازی كەلەسەر ئاستی نیشتمانی بڕیاری لەسەردراوە.

پ- یاری یە جەنگی یەكان لەسەرئاستی تەكتیكی، ((لەسەر ئاستی گۆڕەپانی شەڕ))ئەم یاری یە دروست ئەكرێ بۆ یارمەتی دانی ئەفسەرەكانی ئەركان، بۆ وەرگرتنی گونجاوترین بڕیارگەلێك بۆ ئاراستە كردنی یەكەكانیان لەسەر ئاستی تەكتیكی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە تەكتیكی یەكانی گۆڕەپانی شەڕ.

## بوارەكانی یاری یە جەنگی یەكان:-

یاری یە جەنگی یەكان، لەئاستە جیاوازەكان لەم بوارانەی خوارەوە یاری ئەكرێن:

ا- رامیاری.

ب- ئابوری.

پ- كۆمەلآیەتی.

ج-زانیاری

چ-سەربازی ، كەئەمانە ئەگرێتەوە:-

١-لەئاستە جیاوازەكانی هەر لقێك لەلقەكانی هێزە چەكدارەكان .

٢-لەسەر ئاستی سەركردایەتی یە هاوبەشەكان .

٣-لەسەر ئاستی سەركردایەتیە تێكەڵەكان.

شێوازەكانی لەیەكچونی یاریە جەنگیەكان:-

١-دەستی ((وەكو – مێز ی لمین- یان تابلۆ، یان لەسەر نەخشە))

ب- بەكۆمپیوتەر

١- تەنها وەك پشتیوانیەك((كۆمپیوتەر بەكاردێت ، تەنها بۆ ژماردنی زیانەكان و، ئە نجامی پێكدادانەكان ))وەیاریەكە لەسەر مێزی لمین، یان نەخشە ، یان تابلۆی تایبەت ئەكرێت .

٢- سیستەمێكی تەواو((بەڕێوەبردنێكی تەواوی كردارەكە ))یاریەكە لەسەر كۆمپیوتەر ئەكرێت .

پ-میكانیكی(( ڕواڵەت ئامێرەكان – كەرەستەكان –سیستەمی چەكەكان –لاسایی كەرەوەكانی لیزەر.....هتد))

**خەسڵەتە ڕاستەقینەییەكانی یاری یە جەنگی یەكان .**

١-وردبینی لە دیزاین- تصمیم-(( بە پێی پێویستی مەبەستەكە)) .

٢- نەرم ونیانی لە پەسەندكردنی بڕیارەكان.

٣-ڕاهاتنی لەگەڵ گۆڕاوە بۆناوەوە چوەكان – مدخلات – .

٤-ڕاستەوایی بۆناوەوە چو ەكان و ، هاتنە دەرەوەكان.

٥-توانای گرێدانی بۆناوەوەچوەكان و، هاتنەدەرەوەكان .

بۆچی یاری یە جەنگی یەكان ئەكرێن؟

ا-هەوڵدان بۆ گەیشتن بە زانیاری و ، وێناكردنی شاردراوەكانی ئاینده.

ب-زانینی ڕابوردو و، سود وەرگرتن لەئەزمونەكانی لەكاتی ئێستادا .

پ-هەوڵدان بۆ گەیشتن بە زانیاری لەبابەتێکی دیاری کراو، لەهەلوێستێکی سنوردار.

ج-زانینی ئە نجامەکان، یان کاردانەوەکان کەئەکەوێتە سەر هەندێك بڕیاری دیاری کراو.

چ-گەیشتن بەچارەسەروبڕیار بۆچارەسەرکردنی کێشەکان .

ح- فێرکردنی چڕی کەم خەرجی ،لەکاتە هەڵبژێردراوەکان وەك: فێرکردنی سەرکردەو ئەرکان

خ-مەشق کردن لەسەر هەستان بەڕۆڵ گێڕانێکی دیاری کراو ، لەکاتە دیاریکراوەکاندا، بۆ بەدەست هێنالنی باشترین ئە نجام.

د-بۆ دۆزینەوەی بارودۆخێك کەلەڕاستەقینەدا دەست ناکەوێت.

ر-ئە نجامدانی کارێك کەلەسەر زەوی ڕاستەقینە ئە نجام نادرێت.

ز- تاقی کردنەوەی چەند چالاکی یەکی دیاری کراو، لەیارییەکە پێش جێبەجێ کردنی لەڕاستەقینەدا.

ژ- هەڵسەنگاندنی پلانە سەربازی یەکان ، لەئاستە جیاوازەکان وگەشە پێدانی.

س- پێناسینی هەر کەس و، ڕێکخراوێك بەڕۆڵ و، ئەرکەکانی بەشێوەیەکی کات بۆ دانراو.

ش-چاك کردنی جۆر وکاتە دیاریکراوەکانی بڕیارەکان .

ع-هەڵبژاردنی باشترین جێگرەوەی پێشکەش کراو.

غ-زانینی میکانیزمی ئۆپەراسیۆنە سەربازیەکان ، هەتا جێ بەجێ کردنی ئەرکەکە.

ف-وەلام دانەوەی ئەو پرسیارانەی کە پێویستی بەشیکاری هەیە.

ڤ-هەڵسەنگاندنی چەك وکەرەستەکان لەژێر بارودۆخی دیاریکراودا.

ق-ئامرازی پەیوەندی نێوان بڕیاردەرەکان ..

ك-دیزاین - تصمیم- وتاقی کردنەوەی و سیستەمەکانی ئاینده(( توانا سەربازیەکان-بیرۆکە ئۆپەراسیۆنیەکان-چەك – بیروباوەڕەکان ))

ل-هەڵسەنگاندنی توانا کوشتاریەکانی ئێستا

م-مەشق کردن لەسەر هەر ئاستێك بەکەمترین ژمارەی هێزی مرۆیی وبەکەمترین هەوڵ

## ٨

## سون تزو.... وهونەری جەنگ

### ئەو وشانەی کەمێژوو بەنەمری هێشتیەوە

لەنێوان وتەکانی سون تزو کەلەکتێبەکەیدا دەیڵێ وتاکو ئێستا لەبیری سەرجەم پیاوە ڕامیاری و سەربازیەکانی جیهان ماوەتەوە بۆ نمونە:-

--ئەوەی دەشێ لەجەنگدا بکرێ ، دەشێ لەژیانی ڕۆژانەماندا بکرێت .

—کاتێ ئامادەین هێزەکانمان بجوڵێنین پێویستە خۆمان تەمەڵ دەربخەین ((وەك ئەوەی لەشەڕی ئوکتۆبەر ڕوویدا لەساڵی ١٩٧٢ ))

--قژ سپی نەبوون مانای هێز نی یە. بینینی خۆر ومانگیش مانای چاوتیژی نی یەوبیستنی هەورە گرمەش مانای گوێ سوکی نی یە.

-- بریاری کەم ڕاست لەکاتی پێویستی بۆ یەکلایی کردنەوە، چاکترە لەبڕیاری نمونەیی پاش لەکیس دانی دەرفەت.

-- خۆدەرخستن بە پەشێواوی پێویستی بە توانایەکی گەورەی ڕێکخستن هەیە.

—ئەی هونەری پیرۆز: هونەری نهێنی وشاردنەوە، لەتۆوە فێربووین خۆبشارینەوە. کەدوژمنانمان نەدەمانبینن ونەدەمانبیستن تاکو بەدەستی خۆمان چارەنوسی بگرینە دەست..

—ئەو شوێنەی کەدەست پێشخەردەبین بۆ هێرش کردنە سەری، پێویستە بەنهێنی بمێنێتەوە، چونکە دوژمن لەو کاتەدا ناچاردەبێ بەرگری لەگشت شوێنەکان بکات.

—پێویستە ئاراستەی پلانە سەربازیەکانت وەك ئاراستەی ئاو بێت ، لەسەرەوە بۆ خوارەوەبێت.

—ئەو سەرەتایەی کە پێویستە لە جەنگدا پەیڕەوی بکەین بریتی یەلە: پێویستە لەخاڵی بەهێز خۆمان لابدەین ولەخاڵی لاواز بدەین .

—سوپای بێ ئامرازی گواستنەوەی کەل وپەل بزرە، وە سوپای بێ خواردەمەنی تەواو بزرە ، وە سوپای بێ سەرچاوەی بەهاناوەچوون وپێدان ئەویش بەهەمان شێوە بزرە.

—ناتوانین پێشکەوین وپێشڕەوی بکەین ئەگەر پشت نەبەستین بەرێبەرە ناوخۆییەکان ،لەهەمان ولاٚت کە پێیدا تێدە پەڕین.

—کەدەست بەهێرش دەکەی ، خێرا بە وەك با و تێك ئالاٚو بە وەك دارستان .

—لەهێرش دا وەك ئاگربە، لەجێگیربوون وەك چیا.

—پلانەکانت لێڵ بێت وەك شەو ، کەدەجوڵێی وەك گەردەلول دەرپەڕە .

—گیانی ور ەی سەرباز لەبەیانیان بەرزە، لەکاتی نیوەڕۆ ئەکشێتە دواوە، لەگەڵ دەرکەوتنی ئێوارە بیر لەگەڕانەوە

دەکاتەوەبۆ سەربازگە.

– ڕیگە مەگرە لەگەڕانەوەی سوپای کشاوە بۆ وڵاتەکەی.

-- کەسوپایەك گەمارۆئەدەی ، دەرچەیەکی بۆ هەلاتن بۆ بهێڵەوە. وەفشاری زیاتر مەخەرە سەر دوژمنی نائومێد.

– ئەو دوژمنە ڕاو مەنێ کەوا خۆی نیشان ئەدات ئەکشێتەوە، وەهێرش مەکە سەر ئەوسەربازانەی کەوا شپرزەن و نائومێدن.

– کەنائومێدی باڵی بەسەرتا کێشا پێویستە بجەنگێی.

-- هەندێ ڕێگا هەیە مەیگرەبەر، هەندێ سوپا هەیە پێویستە هێرش نەکەیتە سەری، هەندێ شار هەیە گەمارۆی مەدە، وەهەندێ شوێن هەیە تیایدا مەجەنگێ، وەهەندێ فەرمانی فەرمانڕەواش هەیەنابێ گوێڕایەڵی ببین.

-- سەربازگەکەت لەشوێنێکی بەرز وخۆرەتاو دابنێ، وەسەرمەکەوە شوێنە بەرزەکان بۆگەیشتن بەدوژمنەکان. ، وەبزانەکە شەڕی شاخاوی تێچووی زۆرترە. وە پێویستی بەهەوڵی زۆرتر هەیە.

–

--ڕووبار وشوێنی ئاوی کردنە گۆڕەپانی شەڕ کارێکە تواناو تێچووی زۆری دەوێ.

–بەرزبونەوەی باڵندە لە ئاسمان نیشانەی بوونی بۆسەیە ، تۆقینی گیانەوەان ئاماژەن کەهێرشێکی لەناکاو خەریکە دەست پێدەکات.

–

--کەباڵندەکان لەشوێنێك کۆبونەوە بەڵگەی ئەوەیە دوژمنی لێ نیە ، وە دەنگە دەنگی شەوانە بەڵگەی توڕەییە.

–ئاشتی پیشاندان کەبەڵێن وپەیمان ودڵنیایی لەگەڵ نەبوو ، زۆر جار داونانەوەیەکی ڕێکخراوە.

–ئەگەر ململانێ لەنێوان سەربازەکان بڵاوبوەوە لەسەر بەدەستهێنانی پلە ئەوا چرکەساتی ترسناك دەستی پێکردوە.

--ئەگەر هەندێ تیمی دوژمن هاتنە پێشەوەو هەندێ تیمی تر کشانەوە ئەوە بەڵگەیە فێڵێك لەئارادایە.

–کەدوژمن پێشتدەکەوێ بۆ داگیر کردنی ڕێڕەوێکی تەسك ، دوای مەکەوە هەتاکو ڕێگاکە قایمکراوە، تەنها ئەوکاتە پێشڕەوی بکە کە ڕێگاکە قایمکاریەکانی لاوازبێت.

–دوورلە دیاردە سروشتی یەکان ، شەش کارەسات هەن کەتوشی سوپا دەبن بەهۆی سەرکردەکانیانەوە بریتین لە : هەڵاتن،هەڵگەڕانەوە وەویاخی بوون لەفەرمانەکان ، تێکچون ودارمان، ڕوخان، هەرا، بەزین .

–ڕێکخستنی لێهاتوانەی دەوڵەت، باشترین هاوپەیمانی سەربازە.

–ئەگەر تۆ دڵنیا بووی لەسەرکەوتن دەست بکە بەهێرش کردن، کەئەگەر دژی فەرمانەکانی(( حاکم )) فەرمانڕەواش بوو ، وەئەگەر دڵنیا بوویت لەبەزین، پێشڕەوی مەکە هەرچەندە ئەمە بوە سەرپێچی کردن لەفەرمانەکانی فەرمانڕەوا.

–ئەگەر بۆمان دەرکەوت سەبازەکان ئامادەن بۆڕوبەڕوبونەوەودوژمنان ئامادەییان لاوازە کەواتە نیوەی ڕێگای سەرکەوتنمان بڕیوە.

–هەرکە دوژمنت ناسی وتوانای خۆت زانی، ئەوا بێگومان تۆ سەرکەوتن بەدەست دێنێ وەکاتێ بارودۆخی کەش وهەواو زەویشت زانی ئەوا سەرکەوتنت تەواوتر ئەبێ.

—سەرکردە بێ هاوتاکان ئەوانەن دەتوانن چرکەساتی بلاّوەپێکردنی هێزەکانی دوژمن بقۆزننەوەو هەڵمەت ببەن پێش کۆکردنەوەیان جارێکی تر، وەکاربکەن لەسەرقوڵ کردنەوەی دوبەرەکی وهەرانانەوە لەنێوان ڕیزەکانیان دا،

-- هێرش بکە سەر ولاّتێکی دەوڵەمەند، خاوەن زەوی بە پیت، بۆئەوی خۆراك بۆ سەربازەکانت دابین بکەی.

—کاربکەبۆ خۆلادان لەگومڕایی ودووربکەوە لەگومان ، تاکو ترست لەهیچ شتیك نەبێت پێویستە مردن لەلات کارەسات نەنوێنێ.

--سەرکردەی باش ئەوەیە کەسەرکردایەتی سوپاکەی دەکات وەك ئەوەی سەرکردایەتی یەك کەس بکات لەڕووی زۆر هاوکاری کردنەوە-

-- پێویستە سەرکردە هێمن بێت ، جەخت بکاتەوە لەنهێنی و داد پەروەری و دیسپلین، هەتاکو جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خۆی مسۆگەربکات.

—پلانەکانی دوژمن ناتوانین بەدەست بخەین ، تەنها بەسەربازکردنی هەندێ سیخوڕ ولێرەدا بایەخی بەکارهێنانی سیخوڕ دەرئەکەوێ .

—پێنج جۆری سیخوڕ هەن : سیخوڕی ناوخۆیی،سیخوڕی چوەناوەوە ، سیخوڕی جیاوەوەبوو، ئەو سیخوڕانەی حوکم دراون، سیخوڕە بەردەوامەکان. -

--سیخوڕەکانی دوژمن بگرە وبیانکە سیخوڕی خۆت.

—ئەگەر زانیاری نهێنی دزەی کردە لای سیخوڕ ، پێش ماوەی بڕیاردان لەسەر ئەوە دەبێ ئەو سیخوڕە بکوژێت،وە ئەوەش کە زانیاریەکەی دزە کردوە بۆی.

ئەمە هەندێ لەو گوزارشتانەیە کەلەکتێبی —هونەری جەنگ-ی سون تزو هاتوە، کەبەڵگەی شێوازی بیرکردنەوەی خاوەنەکەیەتی، وە دوور ڕوانینی ئەوە لەسەردەمێکی زووی مێژووی مرۆڤایەتی..

# وەرزی یەکەم

## پلاندانان بۆ جەنگ

## چۆن بڕیاری جەنگ ئەدرێت؟

لەژیانی نەتەوەکاندا هیچ شتێك لەبڕیاردان لەجەنگ ترسناکتر نی یە . جەنگ هەر بەوەوە ناوەستیٚ کەگۆڕەپانێکی خوێنە وگیان کێشانی سەربازەکانە تیایدا ، بەڵکو ڕەنجی بەکۆمەڵی گشت ئەندامانی کۆمەڵگایە کەڕەنگە هەموو وڵات بکاتە زەمینێکی وێرانەو کاول. لێرەوە نابێت بەهیچ جۆرێك جەنگ بەئاسانی وەرگرین. بەڵکو دەبیٚ هەڵوەستەیەك بکەین پێش بڕیاردان بەهەڵگیرسانی جەنگ.

پاشان زانینی هونەری جەنگ گرنگی یەکی زیندەیی یە بۆ دەوڵەت . ئەوە مەسەلەی ژیان ومردنە هەروەکو ڕێگایە بۆ دەشتی ئارام و ەیاخود بەرەو وێرانە.لەبەر ئەوە جەنگ دۆزێکە هەمیشە شایانی توێژینەوە و پشکنین و وردبینی و پوختەکردنە. بەهیچ شێوەیەك ناکریٚ پشت گویٚ بخرێت و بەسادەیی وەربگیرێت .

جەنگ مەسەلەیەکی ترسناکە بۆ دەوڵەت .گۆڕەپانی ژیان ومردنە، ڕێگایەکە دەڕوات بۆ ژیان یاخود لەناوچوون، لەبەر ئەوە مەحاڵە بەقوڵی خوێندنەوەی بۆ نەکرێت.!

وەپلانی تۆکمەو باش بەبیٚ کوشتار دوژمن بەچۆکا ئەدا.

لەململانێی چەکداریدا پێویستە پیاو لەسەردوو هۆکاری یەکلاکەرەوە ڕابوەستیٚ کەئەمانەن:- پاشای عەقڵ و چاکداری ( فەزیلە ) .کەئەگەر هەردوکیان بەشێوەیەکی دروست بەکارهێنران .ئەمانبات بەرەوسەرکەوتن . لەبەر ئەوە نابیٚ بە سوکی ولاف لێدان مامەڵە لەگەڵ جەنگ بکەین ، بەڵکو پێویستە لە پێشدا هەندیٚ کار ڕایی بکەین کەببێتە ئاسانکاری بۆ سەرکەوتن. گرتنی وڵاتی دوژمن بەسەلامەتی چاکترە لەوێران کردنی ، وەبەدیل گرتنی سوپای دوژمن چاکترە لە لەناوبردنی ، ئەمەش پەیوەستە بە سیاسەتی بەڕێوەبردنی جەنگ . سەد سەرکەوتن لەسەد شەڕ دا چاکترین نی یە، بەڵکو ملکەچ کردنی دوژمن بەبیٚ کوشتار چاکترینە. بەڵام کاتیٚ ناتوانین بەم ئە نجامە بگەین بەو کەرەستانەی لەبەردەستدان، ئەوکاتە هانا بۆ هێزی چەکدار ئەبەین بۆ سەرکەوتن. بە پێی ئەم مەرجانەی خوارەوە:-

-کورت کردنەوەی ماوەی جەنگ .

-کەم کردنەوەی ئازار وزیانی مرۆیی.

-کەمترین زیان گەیاندن بەدوژمن.

وەپێویستە جەنگ بخرێتە چوارچێوە ڕامیاریەکەیەوە وهاوپەیمانی بەستن . هەروەها ئاماژەدەدات بەیەکێتی بەرەی ناوخۆیی و جێگیر بوونی . وە گرنگی ورەی سوپا لەبەرامبەر درزخستنە ناو بەرەی ناوخۆیی دوژمن وکەمکردنەوەی ورەی سوپاکەی . هەروەها هەوڵی داوە ڕێسایەکی جێگیر بدۆزێتەوە بۆ بەراورد کردنی عاقلأنەی نێوان هەردولای کێشەدار. لەو هۆکارانەی دەبنە هۆی سەرکەوتن وەك ورە و توانای هزری وجەستەیی و ژینگە وبارەدۆخی کەش و پلاندانان ودارایی وسیستەم ومەشق و پاداشت وسزاکان .

ئەگەر فەرمالنڕەوا مەسەلەی جەنگ هەڵسەنگێنێ پێش بڕیاردان لەهەڵگیرسانی، وەئەگەر پێویست بێت لەسەری کە پێوانەی پلەی قورسی جەنگ یامەترسی یەکانی بکات ، بەئامانجی زانینی توانای سەرکەوتن یان گریمانەکانی شکست .کە ئەگەرپێویستە فەرمانڕەوا یان ڕاستر وایە هەردەبێ وابکات . ئەوا دەتوانێ لەهەڵسەنگاندنەکەی پشت بەم پێنج سەرەتا جێگیرانە ببەستێ کە هونەری جەنگ بەڕێوە دەبەن یان بڕیاری چونە جەنگ یەکلایی دەکەنەوە کەئەمانەن:-

١- ڕامیاری .

٢-کەش و هەوا .

٣-جوگرافیا .

٤-کەسایەتی سەرکردە .

٥-سیستەمی گشتی.

ڕامیاری، یان یاسای ڕەوشتی ، یان پەیمانی ڕەوشتی نێوان ئەو سەرکردایەتی یەی کەکاردەکات بۆ بەرژەوەندی گەل و ئەو گەلەی دلسۆزی و گوێڕایەڵی بۆ دەنوێنێ. ئەم پەیمانە هانی ئەندامان ئەدات کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی سەرکردەبن . بەبێ ڕاڕایی وبەبێ ترس لەئەنجامەکان (( مەشقی بەردەوام والە ئەفسەرەکان دەکات کە ئامادەبن بۆ جەنگ، هیچ دوودڵ وڕاڕا نەبن . هەروەك سەرکردەش ئامادەیە ڕۆڵی خۆی بگێڕێ ))

کەواتە ڕامیاری ئەو شتەیە کەلە پێناویدا گەل لەگەڵ دەسەلأتی بالأدا هاوپەیمان ویەکگرتووە . هەروەها ئەوان دوای ئەم سەرکردایەتی یە دەکەون. بێ گوێدانە ژیانی خۆیان وبێ ئەوەی بیر لەنا پاکی کردن بکەنەوە . بەلأم کاریگەری واتایی بۆ ڕامیاری بەئەم چەمکە واتا پێکەوە ژیانی گەل وسەرکردەکانە بەدڵسۆزی. بەجۆرێك کەگەل لەگەڵ سەرکردەکانی دەژین هەتاکوو مردن بێ سڵ کردن لەمەترسی یەکانی مردن. پاشان چاودەبڕێتە سەر مەسەلەی سەرکردایەتی کردن : سەرکردایەتی واتە خەسڵەتەکانی جەنەڕاڵ، لەڕوی دانایی وڕاست گۆیی ومرۆڤایەتی و ئازایەتی وپابەندی. پاشان ئەم چەمکە بەکرداری سەربازی شی دەکاتەوە.

کەش وهەوا ڕاهاتنە بە گۆڕانکاریەکانی ئاو وهەوا لەماوەی شەو وڕۆژ وسەرماو گەرما و کاتەکان وهەرچوار وەرزەکە وهەوروبا بەلأم جوگرافیا بەرزو نزمی زەوی دەگرێتەوە لەچیا ودۆڵەکان ، مەترسیەکان و ڕادەی سەلامەتی . زەوی کراوە وپڕەوە تەسکەکان ، گریمانەکانی ڕزگاربوون ومردن . بەلاٍم کەسایەتی سەرکردە یان خەسڵەتەکانی ئەتوانین بڵێین کەسەرکردە

هێمایە بۆ چاکیەکانی دانایی ودڵسۆزی (( خۆبەخت کردن لەکار )) ڕەوشت بەرزی و ئازایەتی و توندی .

هەندێ خەسڵەتی بنچینەیی وئامۆژگاری گرنگ هەیە بۆ هەرکەسێ بیەوێت ببێ بەسەرکردە ئەمانەن:-

- هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی : گەردەتەوێ ببی بەسەرکردە دەبێ بەرپرسیارێتی کارەکانت وکاری ئەوانەی سەرکردایەتی یان دەکەی هەڵبگری. ، دەسەڵاتەکانت بەهاوسەنگی وبە لیزانی و بەگیانی دەست پێشخەری بەکاربهێنە.

- خۆت بناسە : ڕاستگۆ بە کاتێ بڕیار لەسەر خۆت ئەدەی ، هەمیشە ئاست بەرزیت تاقی بکەرەوە ، هەر ڕۆژێك هەستت کرد تۆ لەوانی ناو چواردەورت ((بازنەکەت ))باشتری ئەم هەستە ئاشکرا مەکە.

- ببە بەسەرکردە بۆ ئەوانی تر :، ژێردەستەکانت وەك نمونەی ئەدگار هاوسەنگ لێت دەڕوانن وئەدگار وڕەوشتت کاریگەری زۆر زیاتریان هەیە لەو ڕێنمایانەی کەدەیدەیت ، یان ئەو سیستەمەی فەرزی دەکەی.

- گەشە بەتواناکانی ژێردەستەکانت بدە :.ئەگەر بڕوات بەخۆت هەیە دەبێ بڕوات بە ئەوانی تریش هەبێت . زۆر بەڕونی وەڵامی داواکاریەکانیان بدەرەوە. بەلام مەچۆ ناو وردەکاریەوە . ئەوە بۆ خۆیان بەجێ بهێڵە .

- همیشە ئامادە بە. : دڵنیا بە لەوەی کەهەموان ئەرکەکانیان ئەزانن ، وەئەگەر پرسیاریان لێت کرد لەهاندەری پشت هەندێ لەئەرکەکان ، وەڵامیان بدەرەوە وبواریان بدە پێش بکەون و خۆیان چارەسەری کێشەکانیان بکەن . بەلام بێ ڕاوێژ پێ کردنیان پەیمانی کارێك مەدە.

- گرنگی بدە بەبەختەوەری فەرمانبەران :، کێشەکانیان بزانە کە کەسێك ناتوانێت ڕێگری بکات لەوەی کە هاوکاری گونجاو وکرێ و موچەکانیان وەرگرن . وەڕێز لە کاروباری تایبەتی یان بگرە .

- ئەوەی ڕوو ئەدات باگشت فەرمانبەران بیزانن : کارێك بکە ڕێگە لە پڕوپاگەندە بگرێت، چونکە دەبێتە هۆی توڕەبوون وهیوا بڕان .

- با ئامانجەکانت ئامانجێك بن بەدەست بهێنرێن: ، ئامانجی ناڕاستەوایی ئەبێتە هۆی داڕوخان وهەست برینداركردن، وە ئامانجی عاقڵانە بەخێرایی ئەتگەیەنێتە سەرکەوتن.

- بڕیاری دروست ودیاریکراوە بدە، : هەرکە هەستت کرد بڕیارێکی هەڵەت داوە ئازابە وەپێش کارلەکارترازان بیگۆڕە.

- تێبگە لەکاری خۆت، لە پێشەوە بە بۆ زانینی ڕوداوەکان کەتایبەتن بەکارەکەت، قسەبکە لەگەڵ ئەو کەسانە کەئامادەی کۆنگرەکانن . یان ئەوانەی شارەزایی دەرئەخەن لەو بوارانەی کەتۆ نایزانی وخۆت دروستی مەکە ومەچۆ سەر ڕابوردوو.

- بارودۆخی کاری بەکۆمەڵی ئامادەبکە : هەوڵ بدە کارمەندەکانت بۆ گشت پڕۆژەکان ڕابسپێرە ،کاتێ بتوانرێت ئەوە بکرێت . وە ڕاهێنان بکە بەبەکارهێنەران تابزانن چی پێشکەش دەکەن وە دڵنیا بە لەوەی هەریەکەیان ئەوەی لەسەریەتی دەیکات ، وە بۆ هەر دەسکەوتێك ئاهەنگ بگێرە.

- بەلام مەبەست لە سیستەمی گشتی ، شێوازی ڕێکخستنی سوپایە وەدابەش کردنی بەشێوەیەکی دروست بۆ یەکەکان. وەشێوازی دابەش کردنی پلەی سەربازی لەنێوان ئەفسەرەکان ، وە چاك کردنی ڕێگاکانی دابینکراوەکان ((امدادات ))کە دەگاتە سوپا وە کۆنترۆڵ کردنی ڕێژەی تێچووی سەربازی.

وەسیستەمی گشتی ، ڕێکخستنی سوپا وئاراستە کردن وپێدانی پلەی گونجاو بۆ ئەفسەران دەگرێتەوە، هەروەها کۆنترۆڵ

**کردنی تێچووی سەربازی ، دەبێ ئەم هۆکارانە زانراو بێ لەلای گشت سەرکردیەکی سەربازی ، هەرکەسێك دەیزانێ سەردەکەوێت، بۆ ئەوەی پێشبینی ئەنجامی جەنگێك بکەی ئەم هۆکارو خەسڵەتانە دەکرێ شی بکرێنەوە لەم حەوت بەراورد کاریەدا :-**

**- کام سەرکردایەتی بالاّ گەورەترین دەسەلاّتی ڕەوشتی و وریایی هەیە؟ ڕزگاربووە.**

**- کێ سەرکردەی زۆر بەتوانایە؟ ڕزگاربووە.**

**- کام لا بارو دۆخی زەوی وکەش وهەوای گونجاوی هەیە؟ ڕزگار بووە.**

**- لە کام لەم دولایەنە بڕیارەکان بەتەواوی جێبەجێ دەکرێن؟ ڕزگاربووە.**

**- کام لەم دوو سوپایە لەچەك وتەقەمەنی باشترە؟ ڕزگاربووە.**

**- لەکام لا ئەفسەر وسەربازی مەشق پێکراو بە باشترین مەشق هەیە؟ ڕزگاربووە.**

**- کام لا توندوو بێلایەنترە لە هەڵسەنگاندنی پاداشت و سزاکان؟ ڕزگاربووە.**

**دەبێ ئەم هۆکارانە زانراو بن لەلای گشت سەرکردەیەك ئەوەی کۆیان دەکاتەوە سەرکەوتوو دەبێ ، جگە لەمە بۆ سەرکەوتن شکست دێنێ.**

**لەبەرئەوە لەگشت ڕاوێژێکت ولەشێوازی بیرکردنەوەت - بۆ تێگەیشتن لە بارودۆخی زەوی شەڕ - ئەم توخمانە بکە بناغەی بەراورد کردنت. بەم شێوەیەی خوارەوە :-**

**١- کام لەم دوو فەرمانڕەوا یە زۆر پابەندە بە توخمەکانی یاسای ڕەوشتەوە.؟**

**٢- کام لەودووسەرکردەیە زۆر بەتواناو پڕ ڕێکخستنە؟**

**٣-توخمەکانی ئاسمان وزەوی لەبەرژەوەندی کام لەم دولایەنەیە؟**

**٤- کام لەم دوولایەنە پەیرەوی هەموو سیستەمی گشتی ئەکات ؟**

**٥- کام لەم دوو سوپایە بەهێزە ((بەورەو جەستەو تەقەمەنی))؟**

**٦-ئەفسەرانی کام لەم دوو سوپایە مەشقی زۆریان کردووەو زۆر ئامادەن؟**

**٧-کام لەم دوو سوپایە پابەندن بەسەراتاکانی پاداشت وسزا؟**

**لەئەنجامەکانی ئەم حەوت پرسیارە ئەتوانین بزانین کێ سەردەکەوێ و کێ دەبەزێ . ئەو سەرکردەیەی گوێ لەڕاوێژم دەگرێ و کاری پێ دەکات دوژمن دەشکێنێ وسەردەکەوێت ، ئەوەی بە مجۆرەیە پێویستە بەردەوام بێت لە پێگەی سەرکردایەتی. ئەو سەرکردەیەی گوێ لە ڕاوێژم ناگرێت وکاری پێ ناکات، توشی بەزین دەبێ ئەوانەی لە مجۆرەن پێویستە دەر بکرێن لەخزمەت. کاتێك هەنگاو ئەنێی تاسود وەربگریت لە پەیرەوکردنی ڕاوێژەکانم ، جەخت کەرەوە لە پەنا بردن بۆ هەر بارودۆخێکی شیاو وتوخمێکی یارمەتیدەر کەدەکەوێتە دەرەوەی چوارچێوەی ئاسایی وزانراو.**

**لەسەر بنەمای ڕادەی گونجاوی بارودۆخ ، پێویستە مرۆڤ پلانەکانی ڕێك بخاتەوە ،**

**سەرجەم کاروباری پەیوەست بەجەنگ پشت بە خەڵەتاندن دەبەستێ ((جەنگ خەڵەتاندنە)) لەبەر ئەوە کاتێ کە ئەتوانین**

هێرش بکەین ، پێویستە خۆمان وادەربخەین کەناتوانین . وەکاتێ مانۆڕ دەکەین وهێز دەجوڵێنین ، پێویستە وادەرکەوین کە سستین ، وەهەرکە نزیك دەبینەوە پێویستە وابکەین کەدوژمن وابزانێ دوورین. وەکاتێ کەدوورئەبین ، دەبێ وابکەین دوژمن وابزانێ نزیکین..

چەشێك((طعم)) لای خۆت بهێڵەرەوە دوژمنی پێ لەخشتەبەری. وادەرخە بشێوی لەناو ڕیزەکانت بلاو بوەتەوە . پاشان دوژمن بهاڕە. ئەگەر دوژمن لەهەمووڵاوە سەنگەرسازی کردبوو ، ئامادەبە بۆ ڕوبەڕوبونەوەی. ئەگەر دوژمن لەدۆخی لەتۆ باشتر بوو، خۆتی لێ لادە . ئەگەر دژەکەت خێرا تورە دەبێت، جەخت بکە لەتەنگ پێ هەڵپێچینی و تورەی بکە وخۆت بەلاواز پیشان بدە تا دەگاتە ئەوپەڕی لەخۆبایی بوون. ئەگەر دوژمن پشووی دا ، دەرفەتی ئەوەی مەدەرێ . ئەگەر تۆ پشووت دەدا ، جەخت بکە لەوەی هێزی دوژمن شەکەت بکە لەکاتی پشودانت.

هێرش بکە کاتێ ئەو ئامادە نییە. لەو شوێنە دەرکەوە کە پێشبینی تۆی تیاناکات. ئەم کەرەستە سەربازیانە ئەتبات بەرەو سەرکەوتن ، پێش کاتی بەکارهێنانی ئاشکرای مەکە.

ئەو سەرکردەیەی کەلەشەڕدا ئەیباتەوە ، پێش دەست پێکردنی شەڕ هەڵدەستێ بەهەندی هەژمارکاری لەبنکەی سەرکردایەتی. ئەو سەرکردەیەی کەشەڕەکە دەدۆڕێنی ، هەژمارکاری کەمتر دەکات لە پێشدا. بۆیە هەژمارکاری زۆر دەبێتە هۆی سەرکەوتن ، کەمتر دەبێتە هۆی بەزین. لەسەر ئەم بنەمای پلەی گرنگی دانت بەم خاڵە، ئەتوانم پێشبینی بکەم کێ دەیباتەوەو کێ دەیدۆڕینێ.

دەتوانین پێشبینی ئەنجامی هەرشەڕێك بکەین ، لەشیکاری و وەڵامدانەوەی ئەم حەوت پرسیارە:-

١-کام سەرکردەی باڵا گەورەترین دەسەڵاتی ڕەوشتی و واتایی هەیە؟

٢-کام سەرکردە زۆر بەتوانایە؟

٣-کام لەم دولایە بارودۆخی زەوی وکەشی شیاوی هەیە؟

٤-لەکام لەم دو ولایە بڕیارەکان جێبەجێ دەکرێن؟

٥-کام لەم دوو سوپایە لەچەك وتەقەمەنی باڵاترە؟

٦-لەکام لا ئەفسەر و سەربازی مەشق پێکراو بەباشترین مەشق هەیە؟

٧-کام لا زۆرپابەندتر وبێلایەنترە لەهەڵسەنگاندنی پاداشت وسزا؟

## وەرزی دووەم

# جـــەنگ گێـڕان

لەدۆخی بەڕێوەبردنی سوپای گەورە ئامانجی سەرەکی سەرکەوتنی خێرایە. کەئەگەر جەنگ دواکەوت ئەوا چەکی سەربازەکان ژەنگ هەڵدێنێ و تێك ئەچێ ، جۆش وخرۆشی پیاوەکان ئەکوژێتەوە. وە ئەگەرسوپا هێرشی کردە سەرشارەکان، ئەوا توانای خۆی شەکەت ئەکات . هەروەها ئەگەر دەست بەهەڵمەتی سەربازی دوور ودرێژ بکات ئەوا سامانی وڵات بەفیڕۆ ئەچێت.

ئەگەر چەکەکەت ژەنگی کرد وجۆش وخرۆشت کوژایەوە ، وەتوانات توایەوە و سامانت نەما ئەوا فەرمانڕەوایانی وڵاتانی دراوسێ ئەم هەلە ئەقۆزنەوە ، پلەی دانایی هەرچەندێك بێت هیچ کەس ناتوانێت خۆی لەم دەرئە نجامە سەختە لابدات.

سەبارەت بەهێرشی هەڵەشەیی شتمان بیستووە. هیچمان نەبیستووە سەبارەت بەکردەی سەربازی ، کە پلانی باشی هەبوبێت و درێژەی کیشا بێت، هەرگیز جەنگێکی درێژخایان نابینی کەسودی بۆ ولات یان نیشتمان هەبووبێت .

ئەگەر بڕیاری جەنگمان دا دەبێ، ئەو جەنگە پڕپیاکردنی یەکلاکەرەوە بێت . ئەگەر سەرکەوتن دواکەوت، ئەوا سەربازگیانی جەنگینی نامێنێ، ورەی ئەڕوخێت. ،ئیرادەی ئەڕوخێت . وەئەگەر سوپا بۆ ماوەیەکی زۆر گردبووەوە ئەوا داهاتی وڵات بەشی ئەوە ناکات. هەروەها سەربازەکان پەسەندی سەرکەوتنی خێرائەکەن وڕکیان لەکرداری سەربازی درێژ خایانە.

لەڕوداوەکانی جەنگدا ،کە هەزار ماشێنی جەنگی سوك وخێرا لەگۆڕپان هەیە ((بۆ هێرش))هێندەی ئەوەش ماشێنی قورس هەیە ((بۆ بەرگری)) وەسەد هەزار سەربازی پیادەی زرێ، کەدابینکاریەکانیان هەڵگرتووە بەشی ڕۆیشتنی هەزار لی((لی یەکەی پێوانەی چینی یە بۆ درێژی بەرامبەر نزیکەی میلێکە)) ئەوکاتە تێچووی گشتی زۆر ئەکات . (لەناوەوە و بەرەکانی شەڕ) کەبریتی لە حەوانەوەی میوانەکانی دەوڵەت وپارەی هەمەجۆر وەك خەرجی بۆیە کردن وچەورکردن وخەرجی چاکردنی زرێپۆش وئۆتۆمبیلەکان وئەم خەرجیانە دەگاتە بەرامبەر هەزار ئۆنسەی زیو لەڕۆژێکدا ((لەسەردەمی ئەو))ئەمە خەرجی سوپایەکە پێکهاتوە لەسەد هەزارکەس.

کاتێ لەشەڕێکی ڕاستەقینەدا دەستەویەخەدەبین ،مژدەی سەرکەوتن دوادەکەوێت،ئەوا چەکی سەربازەکان وردێتی خۆی لەدەست ئەدا وە جۆش وخرۆشی ئەو سەربازانە ئەکوژێتەوە، ئەگەر شارێکت گەمارۆدا ، هێزەکەت شەکەت دەکەی.

جارێکی تر ئەگەر ماوەی هەڵمەتە سەربازیەکانت درێژ بووەوە . ئەوا داهاتی دەوڵەت هاوتای لێچونی خەرجی یە سەربازیەکان نابێت،

ئێستا پاش ئەوەی چەکەکانت وردێتی یان نەما ،وەگیانی ورەی گشتی ڕوخا وهێزت لاواز بوو و داهاتت تەواو بوو ، ئەوا فەرمانڕەوایانی تەنیشتت دەست ئەکەن بەچاودێری کردنت ، کەدەرفەتی داڕوخان وملهوڕیت بقۆزنەوە ، ئەوکاتە هیچ کەس ناتوانێت – هەرچەندە دانابێت –نەهێڵێ کارەساتی خراپ ڕوبدات لەدەرئە نجامی ئەمەدا.

بە مجۆرە سەرەڕای ئەوەی زۆرمان زانی لەسەرشێتی، خێرا جەنگ هەڵگیرسان ،کە لێهاتویی جەنگی هەرگیز توخنی جەنگی

درێژخایان ناکەوێت. ((سەرکردەی نەزان هەرگیز سەرناکەوێت بەبەکارهێنانی هێزی ستەمکار لەخێراجولاندنی گەورە))

بەڵێ، جموجۆڵ بەخێرایی زۆرگێلی یە، بەلام سەرەڕای ئەوەش خەرجی ڕۆژانە کەم ئەکاتەوە. لەتێکچونی ورەی سوپاو بەکارهێنانی وزە کەم ئەکاتەوە. ڕەنگە هێواشی و لەسەرخۆیی دانایی بێت بەلام لەگەڵ خۆیدا هێمنی و بێ دەنگی و سستی وتەمەڵی ئەهێنێ. ئەگەرئەتوانرێت سەرکەوتن بەدی بهێنرێت، ئەوا خێرایی شێتانە باشترە لە هێواشی دانایی. ئەگەر خێرایی جوڵان بەکارێکی شێتانەدادەنرێت ((دانایی تێدانیە))ئەوا سستی کارێکی شێتانەترە. بەهۆی ئەوەی ئەمەی دووەم ئەبێتە هۆی لێچونی داهاتی گشتی.

هیچ پێشینەیەکی مێژوویی نی یە کەباسی ئەوەبکات ولاتێك سودی بینیوە لەچوونە ناو جەنگی درێژ خایان،

کەسی دنیا دیدە کە ئەهامەتی یەکانی درێژەکێشانی جەنگ ئەزانێ، هەرئەو ئەتوانێ تێ بگات لە بایەخی پێویست بوونی خێرا کۆتایی هێنانی جەنگ.

سەربازی لێهاتوو چاوەڕێ ناکات جارێکی تر موچەکەی وەربگرێت، وەلەدووجار زیاتر بەهاناوە چونی پێبدرێت ((بۆیە پێویستە لەسەری کەخێرا بچێتە ناوجەرگەی شەڕەوەو بەبێ چاوەڕوانی وسستی (( بەمەش پێش دوژمنکەی ئەکەوێت.))

تەقەمەنی جەنگی لەهێلەکانی دواوە لەگەڵ خۆت بەرە، بەلام خۆراك وخواردنەوە لەخاکی دوژمن. ئا بەم جۆرە سوپا بەشی تەواوی خۆراك وخوارنەوەی دەبێت. یەك کەوتنی کۆگای گشتی دەوڵەت، ئەبێتە هۆی ئەوەی دابین کرنەکانی سوپا لەڕێگای بەخشینەوە لە سەرچاوەی دورەوە بێت و ئەمەش ئەبێتە کەم بونەوەی داهاتی گەل. لەلایەکی ترەوە نزیك بونەوەی سوپـــا (( یەکانگیربوونی لەگەڵ دوژمن )) ئەبێتە هۆی بەرزبونەوەی نرخەکانی ناوخۆ، کەدەبێتە هۆی لێچونی سامانی گەل. لەگەڵ نەمانی سامانی گەل بەتوندی ئەناڵێنن بەدەست ئەو باجانەی کەخراوەتە سەریان ، لەگەڵ لەناوچونی سامانی گەل و نەمانی توانا، ماڵەکانی گەل نیمچەچۆڵ ئەبن. لەسەدا سیی داهاتیان لەناوئەچێ کەچی تێچووی خەرجیەکانی حکومەت لەچاککردنی عەرەبانەی جەنگی وزرێ وخودە و کەوان وتیر ورمح وقەڵغان وگۆڕینی ئەسپی ماندوو وگای بارکراو دەگاتەڕادەیەك کە لەسەدا چواری داهاتی گشتی قووت بدات.

بە مجۆرە سەرکردەی دانا پشت بەدوژمن ئەبەستێ وەك سەرچاوەی خۆراك وخواردەمەنی، یەك عارەبانە کەخۆراکی دوژمنی هەڵگرتووە بەرامبەر بەبیست عارەبانەی هێڵەکانی دابین کردنە-امدادات-.((چونکە گەیاندنی یەك عارەبانە بۆ بەرەکانی شەڕ ناوەڕۆکی بیست عارەبانەی تێئەچێ)). بە نمونەی ئەمە ئەوەی کێشی یەك -بیکل- بێت ((کەدەکاتە٦٥,٥ کیلۆگرام)) لەخۆراکی دوژمن ئەکاتەبیست هێندە لەکۆگاکانی دەوڵەت.

ئێستا بۆ کوشتاری دوژمن دەبێ سەربازەکان توڕەبکەین ،هەردەبێ خەسڵەتەکانی سەرکەوتن بەسەر دوژمن ڕوون بکەینەوە. وەهەردەبێ پاداشتەکانیان وەربگرن.((بەشیان لەدەسکەوتەکانی جەنگ))

لەکاتی دەست بەسەراگرتنی دەعارەبانەی جەنگی یان زیاتر دەبێ ئەوەی یەکەم عارەبانەی گرت پاداشت بکرێ، پێویستە ئەو ئالآیەی دوژمن کەبەسەر عارەبانەکانەوەیە بیانگۆڕین بەئالآی خۆمان . وەپێویستە بەباشی مامەڵە لەگەڵ دیلەکان بکەین وبیانهێڵینەوە. ئەمە پێی دەڵێن بەکارهێنانی دەسکەوتەکانی دوژمنی بەزیو بۆ زیاتر خۆ بەهێزکردن ، بۆیە دەبێ خەمی سەرەتا وگەورەت لەجەنگدا سەرکەوتن بێت نەك درێژەدان بە ماوەی هەڵمەتە سەربازیەکان .

بە مجۆرە دەتوانین بڵێین کەسەرکردەی سوپاکان چارەنوسی گەلی بەدەستە، ئەو پیاوەیە کە پشتی پێ دەبەسترێت ، کەئایا گەل بەئاشتیدا دەژێت یان لەمەترسی . وەدەبێت وریای هۆکاری خێرایی بین، یەکێکە لەهۆکارە سەرەکیەکانی بردنەوە ، ئێمە هیچ ئۆپەراسیۆنێکی سەربازی بە پلانی پڕدانابیمان نەبیستوە درێژەی کێشابێت.

خاوخلیچکی لەهێرش کردن بەبێ بیانوو ، ئەبێتە هۆی تێکچونی چەکەکان و دامرکاندنەوی ورەی سوپا وە لێچوڕینی سامانی دەوڵەت بەبێ بیانوو، ئەمەش ئەبێتە هۆی ئە نجامی پێچەوانە . لەدوای ئەمە چ وەك هێرش کردن بۆسەر دوژمن یان دوژمن بۆ خۆی یان دوژمنەکانی دیکەت ئەم دەرفەتە(( زێڕینە )) بقۆزنەوە بۆ هێرش کردنە سەرت ، پاش ئەوەی خۆت خۆتت لاواز کرد.

خاڵی خۆراك وخواردەمەنی هەیە ، کەدەبێت سەرجەم ئامڕازەکانی بەردەست بەکار بێت بۆ بەدەست خستنی خۆراك لەدوژمن لەڕێگای دەسکەوت وشتی تر، گواستنەوەی دابین کراوەکان لەولآتەوە زۆر ئەکەوێت لەسەر هەوڵ و پارەو کات . وەکڕینی خۆراك لەناوچەکانی نزیك گۆڕەپانی شەڕ زیانێکی گەورەیە، کەلەو نا وچانە نرخەکان بەرز ئەبنەوە.

پێویستە پێداگری بکەین لەسەر مەسەلەی دەسکەوت ، چونکە بەدەست خستنی یەك گەڕۆك گەنم لەگۆڕەپانی شەڕ، دەکاتە بیست گەڕۆك کەلەنیشتمانی دایکەوە گواستراوەتەوە . بەدەست خستنی یەك گەڕۆك ئالف لەناوچەی شەڕ، دەکاتە دەست خستنی بیست گەڕۆك لەکۆگاکانی نیشتمانی دایك.

پێویستە لەسەر سەرکردە پاداشتی ئەو سەربازانە بکات کەدەست ئەگرن بەسەر کەرەستەکانی دوژمن ، لەچەك وعارەبانەو شتی تر .

## وەرزی سێیەم

# هێرش بەخەڵەتاندن

هەموو جەنگێك پشت بەخەڵەتاندن دەبەستێ ، كاتێ تواناى هێرشت كردنت هەیە، واخۆت دەربخە كەتواناى نیە . وەكاتێ بایەخ بەئامادەسازی(( التعبئە )) دەدەیت، وادەركەوە كەگوێی نادەیتێ. كەدەتەوێ نزیك بیتەوە ، دەبێ ئەوانی تر واهەست بكەن كەتۆ دووریت . پێچەوانەش ڕاستە .

خۆراكێك (( طعم )) پێشكەش بكە بۆ ڕاكێشانی دوژمن، لەكاتی تام كردنی لەو دەستكەوتە لێدانێكی كوشندە لێی بدە . پێش ئەوەی سەرلەنوێ هاوسەنگی خۆی ڕێكبخاتەوە . ئەگەر چەكداریوو سەرەڕای ئەوە یەدەكی خۆت دوو هێندە بكە . ئەگەر بەهێزبوو هەوڵی پێچ وپەنا (( مراوغە ))و خۆلێلادان بدە . ئەگەر شۆڕشگێڕ بوو، ئیرادەی بشكێنە . ئەگەرخۆی بەسەرشۆڕ وبێدەسەلاٍت دەرخست ، ئەوا گیانی فیز وخۆبەزلزانینی تێدا بچێنە. ئەگەر هێزەكەی پشویان ئەدا، بەهێرشی یەك لەدوای یەك هەراسانیان بكە. ئەگە یەكیان گرت، بڵاوەیان پێ بكە . لەكاتێك كە شلەژاوە لەناكاودا پڕی پیابكە(( مباغتە )) .

واتە هێرش بكە لەكاتی پێشبینی نەكراو . ئەمانەكلیلی سەركەوتنن بۆ هەرستراتیژێك ، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها لەگۆڕەپاندا نەبێ ڕەنگ ناداتەوە.

گرتنی ولاٍتێك بە ساغی ، باشترە لەوێران كردنی ، وەیەخسیر كردنی لیوایەكی دوژمن ، باشترە لەوێران كردنی . هەروەها كەتیبە وسریەو دەستەش .لەبەرئەوەی(( بەدەست خستنی سەركەوتن لەسەد شەڕ چاكترین نی یە ، بەڵكو ملكەچ كردنی دەژمن بەبێ كوشتار چاكترینە )). بۆیە لەجەنگدا باشترین شت لێدانی ستراتیژی دوژمنە پاشان لێدانی هاو پەیمانێتیەكانی ، پاشان هێرش كردنە سەرسوپاكەی ، وەخۆلادان لەهێرش كردنە سەر شاری قایمكراو(( سەنگەر سازی كراو )) مەگەر لەكاتی پێویستدا .

بە مجۆرە كوشتارو سەركەوتن لەگشت جەنگەكان لوتكەی لێهاتوویی نیە ، زاڵ بوونی گەورە تێكشاندنی بەرگری دوژمنە بەبێ كوشتار.

سەرجەم ئیشەكانی جەنگ لەسەر خەڵەتاندن وەستاوە .بۆیە كاتێ دەتوانی ، خۆت بەبێ توانا دەربخە . كاتێ كەچالاكیت، خۆت بەتەمەڵ دەربخە. كاتێ نزیكی خۆت بەدوور پیشان بدە. بۆ فریودانی، لەخشتە بردنێكی پێشكەش بكە. خۆت بەهەراو كێشەوە دەربخەو لێی بدە، كاتێ بەچڕی تەماشا ئەكات ئامادەبە لەدژی . كاتێ بەهێزە خۆتی لێ لادە. پێویستە گاڵتە بەجەنەڕاڵی سەركردەیان بكەیت وشپرزەی بكەی. ،واخۆت دەربخە كەهەست بەكەمی دەكەیت وهانی فیز زلیەكەی بدە. دەبێ

بەردەوام بیت لەفشار خستنەسەری وماندووی بکەی. کەدەبیینی یەکگرتووە ، ریزەکانی لەیەك جیاکەرەوە. کەدەبینی ئامادە نیە ، هێرش بکە سەری. تەقە مەکە کاتێ دوژمن لەوێ نیەو چاوەڕوانت ناکات.

بە پێی پلانی بەڕێوەبردنی جەنگ ، کاتێ ئێمە دە هێندەی دوژمن بین ، گەمارۆی ئەدەین. کاتێ پێنج هێندەی بین هێرش دەکەینە سەری. کاتێ دوو هێندەی بین دابەشی ئەکەین . کاتێ وەك یەك بین ئەتوانین دەست بەشەڕبکەین. وەکاتێ نیوەی ئەو بین هەڵدەستین بەشەڕکردنی کشانەوە. کاتێ لەژمارەو چەك لەو کەمتر بین خۆمانی لێ لائەدەین . بەم شێوەیە سوپای بچوك بەئارامی بەرەنگاری دوژمن ئەبێتەوە.

هەروەها سون تزو وادەبینێ کەهەرکەسێ دوژمنەکەی ناسی وخۆی ناسی سەرکردایەتی سەد شەڕەکات بەبێ مەترسی. وەئەوەی دوژمنەکەی ناناسێ بەلام خۆی دەناسێ ، سەرکەوتنێك بەدەست دێنێ وشکست دێنێ . وەئەوەی دوژمنەکەی ناناسێت وخۆیشی ناناسێت ، لەگشت شەڕیکدا لەبازنەی مەترسی دایە. بەرزترین لێهاتوویی سەربازی بریتی یە لەڕێگرتن لە پلانەکانی دوژمن بەدژە هێرش، پاشتر نەهێلی پارچەکانی دوژمن یەك بگرێتەوە.(( جیاکردنەوەو بڕینی هێڵەکانی پەیوەندی ودابینکردنەکان )) دواتر هێرش بۆسەر سوپای دوژمن لەگۆڕەپاندا . بەلام خرا پترین ڕامیاری گەمارۆدانی ئەو شارانەیە کە دیواری بەرزیان هەیە. ڕێساکە ئەوەیە کەگەمارۆی شاری خاوەن دیواری بەرز نەدەی. ئەگەر بتوانرێت لەمە خۆت لابدەی. ئامادەکردنی بورجی جولاو وقەلای گوازراوە و هەندێ کاری جەنگی پێویست سێ مانگی تەواوی پێ ئەچێ ، وەخۆڵ دانان بەرامبەر ئەو دیوارانە سێ مانگی دیکەی دەوێ .

سەرکردە(( کەناتوانێت زاڵ بێت بەسەر بێزاریەکەی خۆی لەتێپەڕبوونی کات بەبێ بەرهەم ))فەرمان بە پیاوەکانی دەکات وەك ڕەوە مێرولە هێرش بکەن ، پێش هاتنی کاتی گونجاو بۆ ئەمە. لەئە نجامدا سێ بەشی سوپاکەی بەکوشت ئەدات . کەچی شار هەر بەسەختی دەوەستێ، ئەمەش هەندێ شوێنەواری کارەساتباری گەمارۆدانە.

کەواتە سەرکـــــردەی لێهاتوو دوژمن بەبێ کوشتار ئەشکێنێ ، ئەو شارەکان داگیر ئەکا بـــەبێ گەمارۆدانی . سیستەمی فەرمانڕەوایەتیەکەی ئەڕوخێنێ بەبێ ئۆپەراسیۆنی سەربازی. (( حکومەت ئەڕوخێنێ بەبێ زیان گەیاندن بەهاولاتیان )) لەگەڵ هێشتنەوەی هێزەکەی بە سەلامەتی. کەبەتوندی گومان لە دەسەلاتی فەرمانڕەوایی دوژمن دروست ئەکا ، وەبە مجۆرە -بەبێ لەناودانی یەك سەرباز– سەرکەوتن دەگاتە پلەی تەواوەتی . ئەمەیە شێوازی جەنگ بەخەڵەتلاندن.

ڕێسای جەنگ ئاوایە ئەگەر ڕێژەی هێزەکانت بۆ دوژمن دە بۆ یەك بوو ، ئەوا گەمارۆی دوژمن بدە ، ئەگەر پێنج بۆ یەك بوو یەکسەر پەلاماری بدە. ئەگەر دوو هێندە بوو ین ئەوا سوپاکەمان ئەکەینە دوو بەش (( بەشی یەکەم بۆهێرش بەکاری ئەهێنین و بەشی دووەم بۆ خەڵەتاندن یان نیوەی لە پێشەوە هێرش دەکات ئەوی تر لەدواوە )) ئەگەر ڕێژە وەك یەك بوو ئەوا دەبێ شەڕبکەین لەکاتی خۆیدا(( سەرکردەی بەتواناتر ئەبیاتەوە )) وەئەگەر جیاوازیەکە کەم بوو لەبەرژەوەندیمان نەبوو ، ئەوا دەبێ خۆمان لەدوژمن لابدەین. وەئەگەر جیاوازیەکە گەورەبوو لەزۆر ڕوی بەراورد کاری ، ئەوا دەبێ لەدوژمن هەڵبێین. بەم شێوەیە سەرەڕای ئەوەی تیپی کەم ژمارە ئەتوانێ شەڕبکات بەڕقەوە ، بەلام لەکۆتاییدا بەدیل ئەگیرێت لەلایەن هێزی زۆر وزەوەندی دوژمنەوە.

وەئێستا کەسەرکردە قەلای دەوڵەتە ،ئەگەر ئەو قەلایە لەگشت لایەنێکەوە تەواو بێت ، ئەوا دەوڵەت بەهێزە. بەلام ئەگەر ئەم

قەلایە چەند کەم وکورتی یەکی هەبێت ئەوا دەوڵەت لاوازە.
سێ ڕێگا هەیە کەفەرمانڕەوا مەینەتی بەسەر سوپاکەیدا دێنێ :-
١-فەرمان دەرکردن بۆ سوپا بۆ جوڵەکردن یان کشانەوە ئەو ڕاستی یە نەزانێ کەسوپا ناتوانێ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بێت ئەمە پێی دەڵێن بەربەستی سوپا(( بەکارهێنانی وشەی فەرمانڕەوا مەبەست خاوەنی فەرمانە لەهێڵەکانی دواوە ، چونکە بەڕێوەبردنی سوپا دەبێ لەدورەوە بێت نەك لەهێڵەکانی ڕوبەڕوبونەوە ))
٢-سەرکردایەتی کردنی سوپا بەو شێوازەی کەفەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی پێ دەکات، ئەو بارودۆخە نازانێت کەتوشی سوپا دەبێت ، ئەمەش دەبێتە هۆی نارەحەتی وڕاڕایی دەرونی سەربازەکان .
٣-دانانی ئەفسەران لەسوپاکەی بێ جیا کردنەوە(( پیاوی گونجاو لەشوێنی گونجاو دانانێت ))بەهۆی ئەوەی نەریتە سەربازیەکان نازانێت ئەوانەی پەیوەستن بە خۆگونجاندن بە پێی بارودۆخی دەوروبەر ئەمەش متمانەی سەربازەکان بەفەرمانڕەوا لەق ئەکات . چونکە کەئەندامانی سوپا ڕاڕادەبن ومتمانەیان بەفەرمانڕەوا نامێنێ ، ئەوا کێشەکان سەر هەڵئەدەن لەزۆربەی سەرۆك هۆزەکانەوە . کەئەمەش نانەوەی هەرایە بەئاسانی لەسوپاو دورحستنەوەی سەرکەوتنە .
بە مجۆرە ئەزانین کە پێنج بنەمای سەرکەوتن هەیە :-
١-ئەوە سەرئەکەوێ باش بزانێت کەی شەڕ ئەکا وکەی شەڕناکات .
٢-ئەوە سەرئەکەوێ کەبزانێت چۆن مامەڵە دەکات لەگەڵ شێوە جیاوازەکانی هێز ، کەم وزۆری .
٣-ئەوە سەرئەکەوێ کەسوپاکەی ئەجوڵێنێ بەیەك گیانی ورەوە لەگشت ئاستەکانی سەرکردەو سەرباز .
٤-ئەوە سەرئەکەوێ کەباش خۆی ئامادە کردوە ، پاشان چاوەڕوانە کەدوژمنەکەی لەبێ ئاگاییدا بگرێت .
٥-ئەوە سەرئەکەوێ کەسەرکردەیەکەو سەرپشك کراوە وفەرمانڕەوا دەست ناخاتە ناو کاروباریەوە. (( فەرمانڕەوا فەرمانی گشتی دەرئەکات ، بەلاَم سەرکردە ئەو فەرمانانە جێ بەجێ ئەکات بەو شێوازەی کەخۆی ئەیبینێت ))
کەواتە ئەگەر تۆ خۆت ناسی ودوژمنت ناسی، پێویست ناکات لە ئە نجامی سەد شەڕ بترسیت ، ئەگەر خۆت ناسی ودوژمنت نەناسی ، هەر سەرکەوتنێك بەدەست دێنی بەزینێکت توش ئەبێت . ئەگەر خۆت نەناسی ودوژمنیشت نەناسی ،لەگشت شەڕێکدا دەبەزێی . ((ناسینی دوژمنت فێرت دەکات چۆن بەرگری بکەیت .ناسینی خۆت فێرت دەکات چۆن هێرش بکەیت ، هێرشی کردن نهێنی بەرگری کردنە ،وەبەرگری کردن پلاندانانی هێرش کردنە ))
ڕاکێشانی دوژمن بۆ شەڕکردن لەگۆڕەپان زۆر بەباشتر دائەنرێت لەشەڕکردن لەگەڵی لەناو شاروقەلاَ . چەنکە هێرش کردن بۆسەرشار مەترسی یەکی گەورەیە وئەبێتە هۆی زیان گەیاندنی زۆر لەڕیزەکانت چ ئەگەر زیانی مرۆیی بێت یان زیانی ماڵی.هەندێ شت هەیە کەلەوانەیە سەرکردە بیکات ونەهامەتی زۆر بۆسوپاکەی بهێنێ. وەك ئەمانەی خوارەوە:-
١-کەفەرمان بەسوپابکات بۆ پێشڕەوی کردن لەکاتێکدا سوپا ئامادە نیەو تواناى نیە، یان فەرمانی پێ بکات بۆ کشانەوە وسوپا بۆ ئەمەش ئامادە نیە ((خاڵێکی زۆر گرنگە ))
٢-دەست خستنە ناو کاروباری سوپاوە بێ شارەزایی لەکاروبارە ناوخۆییەکانی .

٣-دەست خستنە ناو كاروباری جەنگ ، بەبێ شارەزایی لەكاروباری سەربازی .

وە پێنج خاڵی دیكە هەن بۆ سەركەوتن كەئەمانەن :-

-زانینی كاتی دروست( ( كەی دەجەنگێت وكەی ناجەنگێت ) )

-ناسینی دوژمن ( ( بەهێزە یان لاوازە ) )وە چۆنیەتی ڕوبەڕوبونەوەی.

-یەكێتی هێزەكان بۆ ئاما نجەكە بە ئەفسەر وسەرباز ەوە.

—ئامادەكاری تەواو لەگەڵ چاودێری كردنی دەرفەت وقۆستنەوەی بۆ بردنەوەی جەنگ.

—دەست نەخستنە ناو كاروباری سەركردە بەتواناكان.

لەكۆتاییدا ، دوژمنت بناسەو خۆت بناسە . ئەتوانی سەد شەڕ بگێڕی بێ گیانبازی لەیەك بەزینێك ، وەكاتێ دوژمن ناناسی وخۆت ئەناسی ئەوا دەرفەتی سەركەوتن وبەزین وەك یەكە. بەڵام كاتێ خۆت ودوژمنمت ناناسی بەدڵنیاییەوە لەگشت شەڕێكدا بەخرا پی دەبەزیت .

# وەرزی چوارەم

## مانۆڕە تەکتیکی یەکان

هەڵکێشانی دارێکی لاواز لەڕەگەوە مانای بەهێزیت نیە، بیستنی هەورە گرمە مانا ی گوێ سوکیت نیە، وەبینینی خۆر مانای چاوتیژیت نیە.

جەنگ یاری یەکی هونەری یە، ئەوەی دەیگێڕێ دەبێ بزانێت چۆن (یاری دەکا) بە پیشەیی ولیهاتوویی. سوپای سەرکەوتوو ناچێتەشەڕ لەگەڵ دوژمن ، تەنها کاتێك سەرکەوتن مسۆگەربێت. ەلێهاتوویی بەرگری لەخۆشاردنەوەدایە لەشوێنی زۆر نهێنی ودابڕاو لەژێر زەوی . وەلێهاتوویی هێرش وا لە کتوپڕی وزۆر خێرایی دایە. .

بە مجۆرە بنەماکانی هونەری جەنگ بریتی یە لە :-

- هەڵسەنگاندنی دووریەکان، کە پێوانەی دووریەکانی زەوی دەکرێت .
- هەڵسەنگاندی چەندایەتی یەکان ، کە پێوانەکان دەژمێرێت .
- هەڵسەنگاندنی ژمارەکان،کەچەندایەتیەکان دەژمێرێت .
- بەراوردەکانی هێز ،کەبەراورد دەکرێت لەهێزی ژمارەی شەڕکەرەکان .
- دەرفەتەکانی سەرکەوتن ،بەبەراورد کردن دێت وسەرکەوتن بۆ بەهێزەکە دەبێت.

وە پێویستە جموجوڵی سوپا شەڕکەرەکان شان بەشانی یەك بێت لەهات وچۆدا لە پێناوی بەدەستخستنی زانیاری لەسەر لایەکەی تر. وەجەنگاوەرە دێرینە شارەزاکان ، خۆیان بەدوور ئەگرت لەوەی توشی بەزین بن، دەست پێشخەری هێرشیان نەدەکرد وچاوەڕێیان دەکرد، هەتاکو دەرفەتیان دەبوو بۆ بەزاندنی دوژمن . لێپرسراوێتی پاراستنی خۆمان لەئەستۆی خۆمانە کەتوشی بەزین نەبین. بەلاٌم دەرفەتی بەزاندنی دوژمن خۆی ئەماندداتێ ، ((بەهەڵەیەك کەدەیکات))

جەنگاوەری باش خۆی قایم ئەکات لەدژی بەزین،((بەشاردنەوەی جوڵەو شوێنەواری وگرتنەبەری ڕێ وشوێنی ئاسایش پارێزی توند وتۆڵی هەمیشەیی))بەلاٌم ناتوانێت دڵنیا بێت لەتوانای بەزاندنی دوژمن(( دوژمن خۆی خۆی ئەبەزێنێ)).

ڕەنگە ڕێگای بەزاندنی دوژمن بزانیت، بێ ئەوەی بە پێی پێویست بتوانی ئەوە بکەی. سەنگەر سازی لەدژی بەزین پێویستی بە پەیڕەو کردنی تەکتیکاتی بەرگری هەیە. بەلاٌم توانای بەزاندنی دوژمن واتە دەرفەت قۆستنەوە. (( ئەوەی ناتوانێ دوژمنەکەی ببەزێنێ پێویستە لەسەری دۆخی بەگری وەربگرێت)) .

وەرگرتنی دۆخی بەرگری ئاماژە دەکات بەنەبوونی هێزی تەواو. بەلاٌم هێرش پێویستی بە دابین کردنی هێزی زیاترە.

سەرکردەی سەربازی زیرەك لەبەرگری ، خۆی لەحەوت زەوی ئەشارێتەوە.

(( دەقی چینی ئەڵێ:-نۆیەم زەوی –کەمانای شوێنی زۆر نهێنی وشاراوەیە)).٥.

**سەرکردەی سەربازی زیرەك لەهێرش ، وەك بروسکە لەبەرزایی ئاسمانەوە پەلامار ئەدات (( ئاسمانی نۆیەم- واتای زۆر خێراییە . وەهاتن لەوشوێنانەی کە پێشبینی نەکرێت ،کەهیچ دەرفەتێك ناهێڵێ بۆ دوژمن خۆی ئامادەبکات )) لەلایەنی یەکەمەوە ئێمە پاراستنی خۆمان بەدەستی خۆمانە وەلەلایەنی دووەمەوە ئەتوانین سەرکەوتنی تەواو بەدەست بێنین.**

**بینینی سەرکەوتن ، کاتێك پیاوێکی ئاسایی دەبینێ واسەرکەوتن دێت ئەوا لوتکەی جیاکردنەوە نیە، (( بەڵکو ئەوەیە کەڕوەك پێش سەوزبونی ببینی وە پێشبینی ڕوداوێك بکەی کەهێشتا ڕوویندادوە )) هەروەها لوتکەی جیاکردنەوە ئەوە نیە کەشەڕ بکەین ودوژمن ببەزێنین ودەوڵەت پێت بڵێت زۆر باشت کرد ودەستت خۆش بێت ، (( لوتکەی جیاکردنەوە پلان دانانە زۆر بەنهێنی و زۆر بە وریاییەوە بجوڵێی و نیازەکانی دوژمن لەگۆڕ بنێی و پلانەکانی تێك بدەی و سەربکەویت بەسەریا بەبێ ڕشتنی یەك دڵۆپە خوێنێك )).**

**هەڵ کێشانی مویەکی باریك لە پێستی کەروێشکێکی کیوی لە وەرزی باهاردا ، مانای هێزی مەزن نیە، (( پەندێکی چینی بلاَوە واتە وردترین شت ))وەبینینی خۆر ومانگ نیشانەی چاوتیژی نیە، وەبیستنی هەورە گرمە نیشانەی گوێ سوکی نیە. ئەوەی کە دێرینەکان پێی دەڵێن جەنگاوەرە زیرەکەکان،ئەوە نیە کە هەرسەردەکەوێت و بەس ، بەڵکو لێهاتووە لەسەرکەوتن زۆر بەسوك وسانایی. (( ئەوەی بینینی کورت ئەبێتەوە لەسەر ئەوەی کەلێوەی دیارە، بەزەحمەتی سەردەکەوێت ئەوەی بینینی سنوری ئاسایی دەبڕێت ئەوا بەئاسانی سەردەکەوێت. )) کەلەدواییدا سەرکەوتنەکانی ناوبانگی باشی بۆ پەیدا ئەکات لەئە نجامی داناییە فراوانەکەی، وە ڕێزی بۆ پەیدا ئەکات لەئە نجامی ئازایەتیەکەی. ئەو لەشەڕەکانیدا سەردەکەوێت لەبەر نەکردنی هیچ هەڵەیەك . نەکەوتنە هیچ هەڵەیەکەوە ئەوەیە کەسەرکەوتن مسۆگەر دەکات . ئەوە مانای بەزینی دوژمنە کەبەڕاستی بەزیوە .**

**جەنگاوەری زیرەك لەو شوێنە دەوەستێ کە مەحاڵە تێیدا ببەزێنرێت ، وە ئەو دەرفەتە لەدەست نادات کە هەڵکەوتووە بۆ بەزاندنی دوژمن .**

**لەجەنگدا ، سەرکردەی ستراتیژی سەرکەوتوو ئەوەیە، کە دەچێت بۆشەڕ پاش ئەوەی سەرکەوتنی مسۆگەر کردوە. ، کەلەچارەیدا نوسراوە لەیەکەم شەڕەکانیدا سەردەکەوێت ودوای ئەوە چاوەڕویی سەرکەوتنی یەکجارەکی یە .(( لەجەنگدا دەست بکە بەدانانی ئەو پلانانەی کەسەرکەوتن مسۆگەر دەکەن، پاشان سوپاکەت ببە بۆ شەڕ،ئەگەر بەخەڵەتاندن دەستت پێنەکرد ولەجیاتی ئەوە پشتت تەنها بەهێزی زۆرداری بەست ،بەمەش سەرکەوتن مسۆگەر نابێت ))**

**سەرکردەی زۆر لێهاتوو ڕەچاوی یاسای ڕەوشتی دەکات ، زۆر بەتوندی پابەندی سیستەمی گشتی دەبێت . بەم شێوەیە لەتوانایدایە زاڵ بێت بەسەر سەرکەوتندا .**

**لەتێروانینی سەربازیەوە ، توخمەکانی هونەری جەنگ ئەمانەن:-**

---

**٥-کورد ئەڵێت لەحەوت کون خۆی ئەشارێتەوە.( وەرگێڕی کوردی ))**

پێوانی دووری یەکان و ڕوماڵ کردنی زەوی. (( بۆ هەڵسەنگاندنی هێزی دوژمن ))

هەڵسەنگاندنی چەندایەتی یەکان (( هەژماری دۆخی دوژمن ))

هەژماری ژمارەکان(( دانانی بەهایەکی ژمارەیی بۆ هێزەکانی دوژمن ))

بەراوردکردن(( زانینی زانستی یانەی دەرخستنی هێزەکەمان بەراورد بە هێزی دوژمن ))

گریمانەکانی سەرکەوتن (( ئە نجامی بەراوردکردنەکە ))

سوپای سەرکەوتووبە بەراورد بەسوپای بەزیو وەکودانانی قورساییەکە لەسەر تای تەرازوو بەرامبەر بەدەنکۆڵەیەکی بچوك.

دەرپەڕینی هێزی سەرکەوتوو هاوتای لێشاوی ئاوی تەقیوە لە کونێکی بەرزەوە بۆ قولایی قوڵی خوارەوە.

# وەرزی پێنجەم

## هێز و زەبر

فەرماندەیی کردنی کەسانێکی زۆر وەك فەرماندەیی کردنی کەسانی کەمە. ئەمە مەسەلەی ڕێکخستنە . هەروەها شەڕ کردنی کەسانێکی زۆر هەروەك شەڕ کردنی کەسانێکی کەمە .ئەمە مەسەلەی ئاماژەکانە،
سەرەتاکانی بەڕێوەبردنی هێزێکی گەورە هەروەك سەرەتاکانی بەڕێوەبردنی هێزێکی ژمارە کەمە، ئەمە تەنها مەسەلەی ڕێکخستنە. هەروەك چۆن سوپایەکی گەورە ئاراستەی شەڕ دەکەیت ، دەتوانیت سوپایەکی بچوکیش ئاراستە بکەیت، ئەمە مەسەلەی دەرکردنی فەرمان وئاماژەکانە. وە تێگەیشتنی سوپا لەگشت ئۆپەراسیۆنەکانی دوژمن، دەگەڕێتەوە بۆسەرکەوتن لەو ئۆپەراسیۆنانەی کە هێزە تایبەتەکان وکەرتەکانی تری سوپا پێی هەڵدەستێ . وەلەکاتی دەرپەڕینی هێزەکان بە ژمارەیەکی زۆر وا لەدوژمن ئەدا وەك چۆن لەبەردی سپی ئەدا ، ئەمەش باشترین نمونەیە لەلێدانی بەهێز لە لاواز .
پێویستە سەرکردە لەشەڕدا هێزی بنچینەیی بەکار بهێنێت بۆشەڕی دووراو دوورلەگەڵ دوژمن و، هێزی تایبەت بەکار بهێنێت بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن. سەرکردەی لێهاتوو لە بەکارهێنانی هێزە تایبەتەکان وەك بەکارهێنانی سەرچاوەیەکە کەلەبن نایات وەك سەرچاوەکانی ئاو وزەوی .
خۆڕاگرتنی سوپا لەبەرامبەر هێرشی دوژمن بێ ئەوەی ببەزێت پشت ئەبەستێت بە ئۆپەراسیۆنـــەکانی هێزی کت وپڕی ((مباغتە))و هێزی ئاسایی. پلان دانـــەر هێرش دەکات بە هێزی ئـــاسایی و سەرکەوتن بـەدەست دێنێ بـــــەهێزی کت وپڕی ، وە هەرکەسێ بەباشی هێزی کت وپڕی بەکارهێنا هیچ سنورێك پێی ناگات وەك زەوی وئاسمان. لەگەڵ ئەوەی کەهێزی شەڕ جگە لە هێزی ئاسایی وهێزی کت وپڕی بەولاوە هیچی تر ناگرێتەوە ، بەلام تێکهـــەڵکێشکردنیـــان نـــەسەری هەیە نەسامان. هەندێکیان بەهەندێکیانەوە بەستراون ، وهەندێکیان لەهەندێکی تریاندان بێ کۆتایی . بە مجۆرە هێزی شەرکەری بەتوانا لەجەنگدا ئەتوانین بەراوردیان بکەین بەهێزی چەوی خڕ کەئەکەوێتە خوارەوە لەلێرەوارەکانی شاخێکی بەرز ئەویش زەبرە.
((سەرچاوەی وشەی زەبر ( پاڵنانی زۆرە))

شێوازی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی هێزی گەورە هەمان شێواز وبەڕێوەبردنی تیپی بچوکە کە پێکهاتووە لەچەند کەسێك ، ئەمە مەسەلەی دابەشکردنی ژمارەی زۆرە بۆ کۆمەڵە بچوکەکان ، (( دابەش کردنی سوپا بۆ تیپ وسریەو فەسیل و کۆمەڵە و یەکەکان لەگەڵ دانانی سەرکردە بۆ هەریەکەیەك )). شەڕکردن وسوپایەکی گەورە لەژێر فەرمانتدابێت جیاوازی نی یە لەگەڵ شەڕکردن لەگەڵ یەکەیەکی بچوك . ئەمە مەسەلەی دانانی ڕێسای بەکارهێنانی نیشانەو هێما وئاماژەکانە لە پەیوەندیەکان

. بۆ دڵنیاییت لەوەی کەسوپاکەت کە دەتوانێ هێرشی دوژمن خاوبکاتەوە ، وەبەیەکگرتوویی بمێنێ ونەبەزێت ، ئەمە بەتێکەڵ کردنی مانۆڕی ڕاستەخۆ (( شینج – ئەرێنی ))و مانۆری ناڕاستەوخۆ(( چی –نەرێنی )) دێتەدی. لە پێناوی شپرزەکردنی دوژمن. ئاما نجی مانۆڕی سەربازی لەکاتی جەنگدا بریتیە لەسەرلێشێواندنی دوژمن ،کەنیازی ڕاستەقینەمان نەزانێت.
کاریگەری سوپاکەت دەبێت وەك کاریگەری بەردێکی ڕەق بێت کەبەهێزێکی گەورە دەرئە پەڕێت دژی هێلکەیەك ، ئەمەش بە فێربوون وزانینی خاڵە لاواز وبە هێزەکان دێتەدی (( لەهەردوولا خۆت ودوژمن )) .
لەگشت ڕووەکانی شەڕەوە ئەتوانرێت ڕێگای ڕاستەوخۆ بگریتەبەرلە پێناوی چونە پاڵ شەڕەکان. بەلاّم ڕێگای ناڕاستەوخۆ پەنای بۆ ئەبرێت لە پێناوی دابین کردنی سەرکەوتن . ئاشکرایە تەکتیکەکانی ناڕاستەوخۆ – لەکاتێکدا بەتەواوی جێبەجێ بکرێت – هەرگیز بڕانەوەی نی یە بەتەواوی وەك ئاسمان وزەوی ،وەکو ئاوی ڕوبارو لافاوی کانیاوەکان ، کۆتایی نایات . وەکو مانگ وخۆر کۆتاییان دێت تەنها بۆئەوەی سەرلەنوێ دەست پێبکەنەوە. هەروەکو چوار وەرزی ساڵ کەتەنها تێدە پەڕێت تاکو سەرلەنوێ بێتەوە .
لە پێنج هێمای مۆسیقا زیاتر نی یە ، سەرەڕای ئەوەش تێکەڵ کردنی ئەم پێنجە یارمەتی دەرە بۆ دانانی چەندین بڕگەی بێشوماری مۆسیقاو ئاواز. زیاتر لەوەی کەدەتوانین گوێ بیستی ببین. لە پێنج ڕەنگی بنچینەیی زیاتر نی یە(( شین ، زەرد ، سور، سپی ،ڕەش ))سەرەڕای ئەوەش تێکەڵ کردنی ئەم ڕەنگانە پێکەوە چەندین ڕەنگی یەك لەدوای یەکمان بۆ دەرئەچێت زیاتر لەوەی بتوانین بیبینین. لە پێنج تامی بنچینەیی زیاتر نیە(( ترش ، تفت ، شۆر، شیرین،تاڵ ))سەرەڕای ئەمەش تێکەڵ کردنیان تامی زۆرمان بۆ دەرئەچێت کەبتوانین بیچێژین.
لەگۆڕەپانی شەڕدا لەدوو شێوازی هێرش کردن زیاترمان نیە، ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ سەرەڕای ئەمەش تێکەڵ کردنی ئەم دوو شێوازە زنجیرەیەکی بێ کۆتایی مانۆڕ دێتە بەرهەم .
بەکارهێنانی شێوازی ڕاستەوخۆ ئەمانگەیەنێتە شێوازی ناڕاستەوخۆ وەبەکارهێنانی شێوازی ناڕاستەوخۆ ئەمانگەیەنێتە شێوازی ڕاستەوخۆ – بەتەواوی هەروەك جولانەوە لەبازنەیەکی گەیەنراو کەهەرگیز ناگەیتە کۆتایی. هەروەها هیچ کەس ناتوانێت بگات بە کۆتایی گریمانەکان کەلەتێکەڵ کردنی ئەمدوو شێوازە پێکەوە دێتە بەر.

هێرشی سەربازەکان هەروەکو لێشاوی ڕامالەر وایە کەلەڕێڕەوەکەیدا لەگەڵ خۆی بەردی قایمی هەلگرتوە .
وردی لەکاتدانانی سەرکردەبۆ بڕیاری دروست هەروەکو وردبینی باز وایە کەدەیگرێتە بەر، کاتێ وەك بریسکە هێرش دەکاتە سەرنێچیرەکەی . زۆر بەوردی،دەتوانێ بیگرێت و وێرانی بکات ، ((ئەم وردبینی هاتوە لە ئە نجامی باش پێوانەکردن وهەڵسەنگاندنی دوریەکان وهێڵی ڕۆیشتنی نێچیرەکە و گریمانەی کاردانەوەکەی بۆ هێرش کردنەسەری )) لەبەر ئەمە جەنگاوەری ئازا دەبێ تۆقێنەربێت لەهێرش کردنەکەی ، وەلەسەرخۆ بێت لەکاتی بڕیاردانەکانی . دەتوانین بڵێین ووزە (( هێز )) وەکو ڕاکێشانی ژێی کەوان وایە بۆ تێ گرتنی تیر ، وەبڕیاردان وەك ئەو چرکەیەیە کەژێیەکە بەرئەدەین وتیرەکە دەرپەڕێت بەو ئاراستەیەی دیاریت کردووە.
لەناوەندی غەڵبە غەڵب وشپرزەیی شەڕدا، وەك ئاژاوەیەك دەرئەکەوێت بەڕواڵەت ، بەلاّم بەهیچ شێوەیەك ئاژاوە نیە ،

لەناو دۆخی شڵەژان وهەڕەمەکیدا ، ڕەنگە هێزەکەت بێ سەرەو بەرەبێت ، بەڵام سەرەڕای ئەمە قایمکراوە دژی بەزین .

(( بەهۆی چاکی ڕێکخستن ومەشق وبیرکردنەوە ))

خۆدەرخستن بەڕوودانی ئاژاوە(( بۆلەخشتە بردنی دوژمن کەهێرش بکات ))لەسەرەتادا پێویستی بەدۆخێکی پابەندی تەواو هەیە وەك مەرجێکی بنچینەیی ((بۆ دەرچون بەخێرایی لەدۆخی ئاژاوەی درۆینە بۆ دۆخی پابەندی لە پێناوی تێکشکاندنی خێرایی دوژمنی هێرشبەر)) وە ((خۆدەرخستن بەترسنۆکی پێویستی بەئازایەتی هەیە)) وەخۆدەرخستن بەلاوازی ((بۆ بەخشینی هەستی بردنەوە بەدوژمن ))پێویستی بەهێزێکی بە توانا هەیە . شاردنەوەی پابەندی لەژێر چەتری ئاژاوە ، ئەمە مەسەلەی باش دابەشکردنی یەکەکانی سوپایە . وەشاردنەوەی ئازایەتی لەژێر پەردەی ترسنۆکی پێویستی بە ڕادەیەکی زۆری تواناى شاراوە هەیە . وە شاردنەوەی بەهێزی لە پشت لاواز دەرکەوتنەوە بەمانۆڕی تەکتیکی دێتە دی.

پاشان کێ وادەزانێت کەزیرەکە لەیاری کردن بەدوژمن (( بە پێدانی ئاماژەی فێڵاوی )) پێویستە ڕواڵەتە فێڵاویەکەی بپارێزێت ،کەدوژمن لەسەر ئەم بونیاتە هەڵس وکەوت دەکات (( ئەگەر تۆ بەهێز بوویت لاوازی دەرخە بۆ دوژمن ، تاکو هێرش بکاتە سەرت. وەئەگەر لاواز بویت ،جەخت بکە لەدەرخستنی خاڵی بەهێزت. لەلای ئەو. ئەوسا سڵتێ لێ ئەکات. ودوورئەکەوێتەوە پێویستە جموجۆڵی دوژمن لەسەر ئەو ئاماژانە بنیا بنرێت کەئێمە بۆی ئەنێرین. بەمەش لەو شوێنە ئەیهێڵینەوە کەئێمە بۆیمان ئەوێ ))

بەدانانی داو \چەش ، کەدوژمن فریو بدات ، هەمیشەدوژمن بەخشۆکی ئەهێڵیتەوە. پاشا ن بەباشترین پیاوەهەڵبژاردراوەکانت چاوەڕوانی دەکەیت بە وریاییەوە(( ڕەنگە مەبەستی هێزی سەرەکی بێت ))

(( جەنگاوەری زیرەك ئەگەڕێت لەشوێنەواری یەکگرتنی هێزەکان ،گریمانەی کەسانی زۆر ناکات . ئاستی هێزی گشت سوپاکەی هەڵدەسەنگێنێت، پاشان شارەزایی وبەهرە تاکی یەکان ئەدا لەچاو ، پاشا هەرتاکێکی سوپاکەی بەکاردێنێ بە پێی تواناکانی وە داوای پێگەیشتنی تەواو ناکات جگە لەبەهرەمەندەکان )) ئابەم شێوەیە ئەتوانێت پیاوە گونجاوەکان هەڵبژێرێت و سود لە یەکگرتنی هێزەکان ببینێت .

کاتێ سود لە یەکگرتنی هێزەکان دەبینێت ،جەنگاوەرەکانی وەك بەردی چەقیویان لێ دێت چونکە سروشتی بەرد مانەوەیە لەجێگای خۆی کاتێ لەسەر ڕویەکی تەختە وەسروشتی وایە کە گل ئەبێتەوە لەبەرزاییەوە ئەگەر لەسەر لێرەوارێك دات نا، ئەگەر بەردەکە لەسەر شێوەی چوارگۆشە بوو بەخێرایی دەوەستێتەوە . بەڵام ئەگەر لەسەر شێوەی گۆبوو خێراییەکەی زیاد دەکات لەدابەزیندا .

پاشان ئەو وزەیەی کەلە پیاوانی جەنگاوەری ئازاوە هەڵدەقوڵێت ، وەکو ئەو هێزە پاڵنەرە وایە کەبەردێکی بچوکی خڕ پەیدای ئەکات کەلە لوتکەی شاخێکی بەرزی هەزار مەتری یەوە گلۆر دەبێتەوە. ئەمەیە بابەتی وزە(( واتە دەتوانین ئە نجامی گەورە بەدەست بهێنین لەڕێگای هێزێکی بەژمارە کەم ))

## وەرزی شەشەم

# خـاڵـی لاواز وبـەهێز

ئەو سوپایەی کە گۆڕەپانی شەڕ داگیرئەکا وچاوەڕوانی بەیەك گەیشتنە لەگەڵ دوژمنەکەی ، دڵنیایە کە ئەتوانیٌ هاوبازی دوژمنەکەی ببیٌ، بە پێچەوانەوە ئەوەی درەنگ بگاتە گۆڕەپان ، ئەوا پەلە پەلیەتی و ماندوە ، یەك لەزیرەکیەکانی جەنگ ئەوەیە دوژمن ناچار بکەی هاوبازت بێت نەك ئەو تۆ ناچار بکات هاوبازی بیت . ئەوەی یەکە مجار ئەگاتە گۆڕەپان وچاوەڕێی دوژمنە ئەوە ئاسودەیە ، وەئەوەی درەنگدەگات وناچاری شەڕ کردن دەکرێت زۆر ماندوە . لەبەر ئەوە جەنگاوەری باش دوژمن ڕائەکێشێتە زەوی شەڕ و ناهێڵیٌ دوژمن ئەو راکێشیٌ ، ئەمەش ئامازەیەکە بەسودی ئەو ، بۆ ڕێگریکردن لەدوژمن کەبۆ لامان بێن پیویستە ڕیٌ لە پێشڕەوی کردنی بگرین ، کاتیٌ پشو ئەدات ماندوی بکەین ، وەکلتیٌ ئەیەوێت نان بخوات وای لیٌ بکەین لە برسانا بناڵێنێت . پێویستە لە پڕ دەرکەوین ، بەجۆرێك دوژمن نەتوانێت بگاتە جیٌ . بچینە ئەو شوێنەی کە پێشبینی ناکات . هەروەها پێویستە هێرش بکەین بە ژمارەکی زۆر دژی هێزی ژمارەکەم و پەرش وبلاوی دوژمن . وە پێوستە چاودێری دوژمن بکەین بۆزانینی توانا وکەم وکوڕیەکانی وتەشقەڵەیان پیٌ بکەین بۆ زانینی بەرنامەی گشتی جموجۆڵەکانی . وەبپیشکنین بۆ زانینی ڕێ وجیٌ یەکانی ولێکۆڵینەوە لەگۆڕەپانی شەڕ ، وەبەمانۆڕی بچوك تاقی بکەینەوە بۆزانینی خاڵە لاواز وخاڵە بەهێزەکانی .

بەڵیٌ :.ئەو لایەنەی کەیەکە مجار ئەگاتە گۆڕەپانی شەڕ وچاوەڕوانی هاتنی دوژمن ئەکات، زیاتر ئامادەیە بۆ شەڕکردن بەلاٌم ئەوەی دوەمجار ئەگات ، پێویست دەبیٌ لەسەری کە بگات بۆ شەڕکردن ، وەبەماندوێتی و پەرێشانی ئەگاتە جیٌ.
بەمەش جەنگاوەری زیرەك ویستەکانی خۆی ئەسە پێنیٌ بەسەر دوژمندا ، بەلاٌم ناهێڵێ دوژمن ویستەکانی خۆی بسە پێنیٌ بەسەریدا. (( سەربازی زیرەك شەڕ ئەکات بە پێی مەرجەکانی خۆی یاخود هەرگیز شەڕ ناکات . ))
(( سەرکردەی زیرەك )) لەڕێگای لێکۆڵینەوەی بۆ پێشترینەکان ئەتوانێت دوژمن ناچار بکات لێی نزیك بێتەوە ( ئەم چۆنی دەوێتٌ. یان لەڕێگای زیان گەیاندن ئەتوانێت کاری وابکات ) مەحاڵ بێت دوژمن لێی نزیك بێتەوە . (( هەنگاوی یەکەم خۆراکێك پێشکەش دوژمن ئەکات و هەنگاوی دوەم لەشوێنێکی وای دوژمن ئەدات ئازاری پیٌ بگەیەنێت ودوژمن ناچار بکات کە سەنگەری بەرگری بگرێت ))
ئەگەر دوژمنەکەی پشوو ئەدات (( سەرکردەی زیرەك ))هەڵدەستیٌ بە ناڕەحەت کردنی ، ئەگەر دوژمن هێلی باشی دابین

کردنی هەبوو کەخۆراکی بۆ مسۆگەر دەکات ، هەڵدەستێ بەبرسی کردنی دوژمن ، وەئەگەر دوژمن بە ئارامی بارەگا دائەنێت ناچاری جوڵە پێکردنی ئەکات. . جەخت بکە لەو شوێن و خالآنە دەربکەویت کەدوژمن دەبێ پەلە بکات بۆ بەرگری لێکردنی ، زۆر بەخێرایی بچۆ بۆ ئەو شوێنانەی کەدوژمن گریمانەی نەدەکرد تۆ لەوێ بیت.

لەتوانای هەر سوپایەکدا هەیە کە بۆ ماوەیەکی دوور ودرێژ رێ ببڕێت بێ هیچ ڕاڕایی و دڵەڕاوکێیەك ئەگەر ئەو ڕێگایە دوژمنی لێ نەبێت ،ئەتوانیت دڵنیا بیت لەسەرکەوتنی هێرشەکەت ئەگەر هێرشت کردە سەر ناوچەیەکی پاس نەکراو (( خالی لاواز )) هەرواش دەتوانی دڵنیا بیت لەبەرگریەکانت ئەگەر پابەندی ئەو خالآنەبیت کەناتوانرێت هێرش بکرێتە سەری .

(( ئەم ڕستەیە ئالۆزە ،ووتەبێژەکان بەشێوەیەکی تر شیکاری دەکەن ، بۆ ئەوەی بەرگریەکانت بەهێز بکەی پێویستە لەسەرت بەرگری و سەنگەرسازی گشت شوێنێك بکەیت (( تەنانەت ئەو شوێنانەش کە گومانی هێرش کردنە سەری ناکەیت )) وەئەو شوێنانەی کەگومان دەکەی هێرش بکەنە سەری پێویستە سەنگەر سازی زیاتری بۆ بکەیت )).

سەرکردەی زیرەك لەهێرشکردن ، دوژمنەکەی نازانێت بەرگری لەچی بکات . بەلآم سەرکردەی زیرەك لەبەرگری ،دوژمنەکەی نازانێت لەکوێوە و چۆن هێرشی بکاتە سەر. .وەك هەنگاونان لەقەدەر ئەوەی کەبەنەرمی وزۆر نهێنی دێت .لێیەوە فێربە کەلەبەر چاوان خۆت بزربکە وهیچ دەنگێکت لێوە نەیات (( ئارامی تەواو ))بەمە بەدەستی خۆت بڕیار لەسەر چارەنوسی دوژمنەکەت ئەدەی ، ئەگەر مەبەستت خالی لاوازی دوژمن بوو ،ئەتوانێت بەشێوازێك پێشڕەوی بکەیت ، کەڕێگری کردنت مەحاڵ بێت ، وەدەتوانیت بگەڕێیتەوە وخۆت ڕزگار بکەی لەمەترسی ڕاونانت لەلایەن دوژمنەوە ئەگەر جوڵەکانت لەجوڵەی دوژمن خێراتربوو. ئەگەر دەتەوێت شەڕ بکەیت ئەتوانیت پاڵ بەدوژمنەوە بنێیت کە یەکانگیرت بێت تەنانەت ئەگەر خۆی پاراست بێت لە پشت بەرزترین قەلغان وقوڵترین سەنگەر ، ئەوەی پێویستە لەسەرمان هێرش کردنە بۆسەر ئەوشوێن وناوچانەی کەناچاری دەکات لە پەناگەکانی بێتە دەرەوە تابەرگری بکات . (( ئەگەر دوژمن خۆی داگیر کەر بوو ئەتوانیت هێڵی پەیوەندیەکانی ببڕیت وئەو ڕێگایانە داگیر بکە کەبۆ گەڕانەوە پشتی پێ دەبەستێت ' کەناچاری دەکات تاکو بگەڕێتەوە بۆ دابین کردنەوەی ، ئەگەر تۆ داگیرکەر بویت هێرشت چڕ بکەرەوە لەسەر خودی فەرمانڕەوای ولاتی دوژمن . )) ئەگەر حەزت لەشەڕ نەبوو ، دوژمن فریو بدە .ئەتوانین نەهێڵین دوژمن پێمان بگات . بەهۆی جێهێشتنی شوێنەواری بارەگامان ڕێگای دوژمن فڕێ بدەین کەلێی تێ نەگات ومەزەندەی نەکات . بەدۆزینەوەی مانۆرەکانی دوژمن وشوێنی کۆبونەوەی ، لەگەڵ ئەوەی لەبەرچاوان نیمان و بزرین، ئەتوانین هێزەکانمان بەچڕی بهێڵینەوە. بەلآم دەبێت دوژمن دابەش ولەیەك جیا بکەین . ، (( خۆدەرخستنی دوژمن بۆ ئێمە هێزەکانمان ئەتوانین ورد بینەوە بەلآم خۆشاردنەوەمان لێی ناچاری دەکات هێزەکەی دابەشبکات لەترسی هەر هەنگاوێك بیگرینە بەر ئەتوانین سوپایەکی یەك جەستەیی ویەك کۆڵەکەیی کۆبکەینەوە ، بەلآم پێویستە دوژمن دابەش بکەین بۆ پارچەو تیپ بە مجۆرە ئەبینە یەك کۆمەڵەیەکی یەکگرتوو دژی دوژمنێکی پەرت ولەیەك دابڕاو ((٦))

(( ٦ )) سیاسەتی پەرت بکەو زاڵ بە ، تاکو ئێستاش داگیرکەرانی کوردستان دژی گەلی کورد بەکاری دێنن بۆ شکستهێنانی کورد لەیەکگرتن وهێنانەدی ئامانجە نەتەوایەتی یەکانی خۆی .

کەئەوکات دەبینە زۆرینەیەکی یەکگرتوو دژی کەمینەیەکی لیك دابڕاو. ئەگەر ئێمە توانیمان بەهێزێکی زۆرەوە هێرش بکەینە سەر هێزێکی کەم بایەختر ئەوا نەیارەکەمان ئەکەوێتە تەنگانەیەکەوە کەئێرەیی پێ نابردرێت .

دەبێت ئەو شوێنەی هێرشی دەکەینە سەر کەس پێی نەزانێت ، چونکە پێویستە دوژمن ئامادەی هێرشەکانمان بێت لەزۆر شوێنی جیاوازەوە ئەو کاتە هێزەکەی پەرش وبلاو ئەکاتەوە لەئاراستەی جیاواز ، بەمەش ئەو هێزەی کەبەرامبەرمان دەبێت بەبەراورد بەئێمە ژمارەیان کەم تر دەبێت . بەمەش ئەگەر دوژمن هەستا بەبەهێزکردنی پێشەوەی سوپاکەی ئەوا هێزەکەی لەدواوە لاواز دەبێت . وەئەگەر هەستا بە بەهێزکردنی دواوە ، ئەوا لەسەر حسابی لای ڕاستی دەبێت . وەئەگەر هەستا بەبەهێزکردنی لای ڕاستی ئەوا لەسەر حسابی لای چەپی دەبێت . وەئەگەر هێزی بۆ گشت شوێنەکان نارد ئەوا بەمە لەگشت شوێنەکان لاواز دەبێت

(( جەنگی بەرگریکارانە خیانەت لە خاوەنەکەی دەکات ، بەهۆی زۆری داواکردنی پشتیوانی ))

لاوازی ژمارەیی ، سەرچاوە دەگرێ لەئامادەکاری بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو هێرشانەی گریمانە دەکرێت لەچەندین شوینەوە ، بەلاَم بەهێزی ژمارەیی ، لەناچارکردنی دوژمنەوە دێت . کەئەم جۆرە ئامادەکاریانە بکات بۆ ڕوبەڕوبونەوەمان (( کەدوژمن ناچاربکەی هێزەکەی دابەش و پارچە بکات ، پاشان هێرش بکەیتە سەر هەرپارچەیەکی بەگشت هێزەکەت ))

زانینمان بەکات وشوێنی شەڕی داهاتومان ، وادەکات هێزەکانمان چڕ بکەینەوە لە پێناوی شەڕ (( ژماردنی ماوەکان وکاتەکان ، گرتنە بەری ستراتیژی گونجاو، کەرێگا بەسەرکردە بدات سوپاکەی دابە ش بکات ، لە پێناوی ڕێکردن بۆ ماوەی درێژ وخێرا، تاکو بەهێزی گونجاوەوە لەکاتی گونجاو بگاتە شوێنی گونجاو )). بەلاَم ئەگەر کات وشوێن نەزانراو بوو ، ئەوا لای ڕاست ناتوانێت یارمەتی لای چەپ بدات . وەلای چەپ ناتوانێت فریای لای ڕاست بکەوێت . وە پێشەوە ناتوانێت فشاری سەر دواوە سووك بکات ، وەدواوە ناتوانێت پشتیوانی پێشەوە بکات . تەنانەت ئەگەر دووری نێوانیان چەند سەد مەترێکیش بێت .

(( ئەم ڕستەیە لەڕەسەندا چینی یە، شیکردنەوەی وردی دەوێ . کەدەتوانین وێنەی سوپایەك بکێشین، کەیەکەکانی پێشڕەوی دەکەن ( پێشەوە ، پاشەوە، لای ڕاست ، لای چەپ ) بەشێوەیەکی هەڕەمەکی وبەبێ فەرمانی دیاریکراو بۆ شوێن وکاتێ کەدەبێ لەوێبن . کەئەگەر سەرکردە ی سوپا لێگەڕێت ئەوە ڕوبدات (( بۆجولەی هەڕەمەکی ناڕێکخراو ))ئەوا بەئاسانی دەتوانرێت سوپاکەی بەتەواوی لەناوببرێت .

تەنانەت ئەگەر سوپای دوژمن بەژمارە لەسوپای ئێمە زیاتر بوو ئەوە لەئێمە باشتریان پێنادات ، ئەوا من دەتوانم بڵێم ئەتوانرێت ئەوکاتە سەرکەوتن بەدەست بهێنرێت ، (( بەبێ ئەوەی دژی ئەو باوەڕەبین کەدەڵێ کاتێ دوژمن لەئامادەباشی تەواودابێت ئەوا دڵنیا نابین لەسەرکەوتن ، کەمەبەست لێرەدا ئەو سوپای دوژمنەیە کەکات وشوێنی شەڕی ئاینده نازانێ ئەوا ئەو کاتە دەتوانین بەسەریدا سەرکەوین )) سەرەڕای زۆری دوژمن لەژمارە ، ئەتوانین نەهێڵین شەڕ بکات ئەو پلانانە دابنێ کەنیازەکانی دوژمن ئاشکرا ئەکات، وەخوێندنەوە بۆ تواناى سەرکەوتنی پلانەکانی دوژمن بکە.

دوژمن بێزار بکە ، ڕۆژی ڕونی لێڵ بکە ، پاشان سەرنجی چالاکی و بێ دەنگی بدە، وەناچاری بکە خۆی ئاشکرا بکات بۆ ئەوەی خاڵی لاوازی بدۆزیتەوە ، کەڕەنگە هەیبێت ، (( ئەگەر دوژمنت بێزار کرد لە کاردانەوەیدا نیازەکانی ئەزانی ، کەئایا ئەیەوێت

لەبەر چاوان بەشاراوەیی بمێنێتەوە  یان بە پێچەوانەوە ))
بەجوانی بەراوردی سوپای دوژمن بکە لەگەڵ سوپاکەت، تاڵەسەر خاڵە بەهێزەکان و لاوازەکان بوەستێت . وە لەکاتی مانۆرکردن وجموجۆڵی تەکتیکی ، ب اشترین شت کە پێی هەستی ئەوەیە خۆت مەلآس بدەی ونیازی چیت هەیە بیشاریتەوە بە مجۆرە لەچاوی سیخۆڕەکان کەچاودێریت دەکەن و لە پیلانگێڕیەکانی داناترین عەقڵ پارێزراو ئەبیت .
چۆنیەتی وتوانای سەرکەوتن ، پشت دەبەستێ بەڕەفتارو تەکتیك وجموجۆڵی دوژمن ئەمە جگە لە-سەرکردە- هیچ کەسێکی تر لێی تێ ناگات. هەمووان ئەتوانن ئەو تەکتیکە ببینن کەدوژمنی پێ بەزێنرا ، بەلآم ناتوانن ئەو ستراتیژە ببینن کەسەرکەوتنی پێ دێت (( هەموان دەبینن چۆن لەشەڕدا ئەبرێتەوە ، بەلآم ئەوەی کەنابیینن ئەو لیستە درێژەی پلاندانانە کە پێش شەڕەکە کەوتوەو بوەتەهۆی سەرکەوتن ))

ئەوتەکتیکە دوبارە مەکەرەوە ، کە پێشتر پەیڕەوت کردوە وسەرکەوتنی بۆت هێنا ، بەلآم وابکە ئەو ڕێگایانەی دەیگریتەبەر بە پێی بارودۆخی گۆڕاو بێت ، سەرکەوتن یەکە، بەلآم ئەو ڕێگایانەی دەمانبات بۆی نابێ لە چوارچێوەوەی بدەین ،
تەکتیکە سەربازیەکان زۆرلەشێوەی ئاو دەچێ ، ئاو لەدۆخی سروشتی خۆی لەشوێنی بەرزەوە بەخێرایی دەرژێتە نزمایی، بۆیە لەجەنگدا ڕێگای ڕاست ئەوەیە خۆت لەخاڵی بەهێز لابدەیت وبدەی لەخاڵی لاواز (( وەکو ئاو کەئەو ڕێگایە دەگرێتە بەر کە ڕێگری کەمە بۆ ڕۆیشتن )) ئاو ڕێڕەوی خۆی دیاری دەکات بە پێی سروشتی ئەو زەویەی بەسەریدا دەڕوات ، وەسەرباز هەوڵی دابین کردنی هۆیەکانی سەرکەوتن ئەدا ، بە پێی ئەو دوژمنەی کەڕوبەڕوی بوەتەوە . کەواتە هەروەکو ئاو کەیەك شێوەی نەگۆڕی بەردەوامی نیە ، بۆیە جەنگ مەرج یان دۆخی جێگیر نازانێت .
هەرکەسێك ئەتوانێت تەکتیکەکانی بگۆڕێت بە پێی دوژمنەکەی ، ئەوا بەمە سەرکەوتن بەدەست دێنێ وئەم سەرکردەیە دیاری یە لەئاسمانەوە .
هەرپێنج سەرچاوەکە (( ئاو ، ئاگر ، دار ، کانزا ، زەوی )) زاڵ وژێر دەستە نابن بەشێوەی ڕیکخراو . هەروەها چوار وەرزەکە یەك لەدوای یەك بوار بەیەك ئەدەن . هەوەها ڕۆژانی درێژ وکورت هەیە ، مانگیش چەندین پلەی هەیە کەدنیا ڕوناك ئەکاتەوە وهەیەتی بەتەواوی تیا بزر ئەبێت . ( سون تزوو ویستی پەندێك بلێ کەجەنگ – وەك هەر شتێك لەسروشتدا- پشت نابەستێت بەهۆکاری وشك وجێگیر، بەڵکو بەهۆکاری گۆڕاو بە سروشتی خۆی.

# وەرزی حەوتەم

## مانــۆڕ

لەکاتی جەنگدا سەرکردەی گشتی فەرمان لەسەرکردەی بـاڵاوە وەردەگرێت وئامادەکاری وجوڵەو وبلاوە پێکردنی سوپا دەکرێت ،کەلەئەوپەڕی ئامادباشیدا دەبێت ، پاشان گرانترین هەنگاو دێت لەئۆپەراسیۆنە سەربازیەکان ، ئەویش هونەری مانۆڕی سەربـازی یە

.گرانی مانۆڕ وا لەئامادەکردنی ڕێگا پێچەکانە وە، گۆڕینی نەرێنیەکانە بۆ ئەرێنیەکان . ڕزگارکەرە .

هەرکەس پلانەکانی دوژمن نەزانێت ، نـاتوانێت لە پێش شەڕ لێی نزیک بێتەوە . وەهەرکەس نـاوچە دارستـانەکان وشاخەکان و ڕیرەوە تەسك و چاڵاویەکان وزۆنگاوەکان نەزانێت ، نـاتوانێت سەرکردایەتی سوپاکەی بکات لەڕۆیشتن ڕوەو دوژمن ،
هەرکەس پەنـا بۆ شارەزا نـاوخۆییەکان نەبـات ، نـاتوانێت سود لەجوگرافیا وەربگرێت .
کەجەنگ خەڵەتـاندنە بجوڵێ کاتێت ئەمە لە بەرژەوەندیت بێت ،
وەگۆڕانکاری دروست بکە لەو دۆخە ، لەڕێگای بلاو کردنەوەی سوپـا یان کۆکردنەوەی .
کێ لەکاتی خۆیدا ڕێگا پێچاوپێچەکان وڕێگا ڕاستەکانی گرت، لە پێشڕەویدا ئەوا سەردەکەوێت.
ئەمە هونەری مانۆڕە لە پێشڕەویدا .
وەلەگۆڕپـان خێرا بە وەك بـا .
بێ دەنگ بە وەك دارستان .
بەگڕ بە وەك ئاگر .
جێگیر بە وەك شـاخ.

# وەرزی هەشتەم

## هەمە چەشنەکردنی تاکتیکەکانی جەنگ

سەرکردەی بەئەزموون وخاوەنی لێکدانەوە،   هەر دەبێت ڕەچاوی هۆکاری گونجاو  و  نەگونجاو بکات لەکاتی هێرش کردندا ،لەکاتی جەنگدا،  سەرکردەی گشتی فەرمان لە سەرکردەی بالاڕوە وەردەگرێت و،     ئامادەباشی ڕادەگەیەنێت و،   سوپا جوڵە پێدەکات . سوپا کەی  ناجوڵێێنێت" ئەگەر زەوی سەخت بوو  ، بەلام هەوڵی یەکگرتن ئەدات لەگەڵ هاوپەیمانەکانی ئەگەر زەویەکی مەترسیدار بوو .

ئەگەر لەزەویەکی  گەمارۆدراو بوو  ،  پەنا بۆ فێڵی جەنگی ئەبا ، هەندێ ڕێگا هەیە  نابێت بیگرێتە بەر ، وەهەندێ سوپا هەیە نابێت هێرشی بکاتە سەر ، وەهەندێ شار هەیە  نابێت پەلاماری بدات ، وەهەندێ زەوی هەیە بەکەڵك نایات نابێت لەسەری شەڕ بکەیت ،   هەندێ فەرمانی سەرەوە ش  هەیە نابێت جێبەجێ بکرێت .

هەروەك نەریت ، لەکاتی  شەڕدا سەرکردەی سوپا فەرمان لەفەرمانڕەواوە وەردەگرێت ،   وە سەربازەکانی کۆدەکاتەوە وهاونیشتمانیان ئامادە دەکات .   سەرکردە نابێت سەربازگە لەشوێنی  سەخت ومەترسیدار دابنێت .   وەنابێت دوابکەوایت لەزەوی وشك وبیابان،   وەدەبێت پلان دابین بکات بۆ دەرباز بوون لەزەوی گەمارۆدراو   ،    هەروەك چۆن –سوون تزو – ڕامان دەسپێرێت کەلەزەویەکدا  کەهەڕەشەی مردن دەدات  بجەنگێین ، وەهاوپەیمانی ببەستین لە ڕێگا یەکتر بڕەکان، ئەو وادەبینێت کەهەندێ  ڕێگا ئەتوانرێت بۆ هات وچۆ بەکاربهێنرێت، بەلام دەبێ سوپا نەیگرێتەبەر.      وەهەندێ سوپا هەیە نابێت ڕووبەڕووی ببینەوە ، وەهەندێك شار نابێ پەلاماری بدەین و،  هەروەها هەندێك فەرمان لەفەرمانڕەواوە دێت ., لەهەندێك بارودۆخ  پێویست ناکات جێبەجێ بکرێت . وەلەهونەری سەربازیدا باوەڕێك هەیە  ناوەڕۆکەکەی،   گریمانەی نەهاتنی دوژمن نەکەین ،    دەبێت  پشت ببەستین بە ئامادەبوونمان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی .

کەدەجەنگی لە وڵاتێکی سەخت (( سەرچاوەی ئاو یان خۆراکی تیا نیە، خاکەکەی نزماییە ))، سەربازگەی لێ دامەنێ، لەگەڵ هاوپەیمانەکانت یەکبگرە  لەشارێك کەڕێگافراوانەکانی  یەك دەبڕن .(( واتە گواستنەوە ی ئاسان ))      لەشوێنی دابڕاو ومەترسیدار لۆژەلۆژمەکە  ،  ئەگەر تۆ لەزەوی گەمارۆدراو وچواردەور گیراوی  پەنا ببە بەر خەڵەتاندن ، ئەگەر لەهەڵوێستێکی بێ ئومێدیت(( زەوی مەگ ))ئەوا دەبێ هەر بجەنگیت.

١- هەندێ ڕێگا هەیە مەیگرە بەر(( ئەوەی کەترست هەیە دوژمنەکەت تەڵە  ،  یان بۆسەی بۆت دانابێت ))

٢-هەندێ سوپا هەیە هێرشی مەکە سەر (( ئەگەر دەرفەتێکت بینی بۆ هێرش  ،بەلام لاواز تر بوویت لەوەی سەرکەویت، هێرش مەکە )) .

**٣-هەندێ شار هەیە گەمارۆی مەدە(( شارێك گەمارۆ مەدە نەتوانی بەرێوەی ببەی یان واز لێهێنانی هیچ زیانێکی بۆت نەبوو ))**

**٤-هەندێك هەڵوێست هەیە پێویست ناکات بەتوندی شەڕی لەسەر بکەیت .**

**٥-هەندێ فەرمانی فەرمانڕەوا هەیە پێویستە گوێڕایەڵی نەبیت (( کاتێ ڕێگای دروست ئەبینی . بیگرەبەر وچاوەڕێی فەرمان مەکە )).**

**سەرکردەی شارەزا بەو تایبە تمەندیانەی کەدێتە بەر لەهەمەجۆرکردنی تەکتیکاتی جەنگی بە پێی نۆ گۆڕانکاریەکە ،ئەزانێ چۆن مامەڵە لەگەڵ سوپاکەیدا بکات ، کەبەباشترین شێوازبەڕێوەی دەبات . بەڵام سەرکردەی نەشارەزا لەونیشانانە ڕەنگە زانیاری هەبێت لەسەرخاکی ولأتەکە، بەلأم ناتوانێ ئەم زانیاریانە بگۆڕێت بۆ سودێکی کرداری .**

**سەرکردەی نەشارەزا لەکاروباری جەنگ و هونەرە تایبەتەکانی بەگۆڕینی پلانەکان بە پێی گۆڕانکاریە جەنگیەکان ،هەرچەندە زانیار بێت بە پێنج خەسڵەتەکە(( کە پێشتر باس کرا ))ئەوا سەرکەوتوونابێت لەبەدەستهێنانی هیچ سودێك لەسەربازەکانی .**

**(( ئەگەر ڕێگاکە کورت وبێ مەترسی بوو- بیگرەبەر ))**

**(( ئەگەر سوپای دوژمن دابڕاو بوو –هێرشی بکەسەر ))**

**(( ئەگەر شاری دوژمن لەدۆخێکی پڕ مەترسی بوون- گەمارۆیان بدە ))**

**(( ئەگەر هەڵوێست ڕێگای ئەدا بەهێرشی ڕامالین – پیویستە هەوڵی هێرش بدەی ))**

**(( ئەگەر گونجاو بوو لەگەڵ نەریتە سەربازیەکان ، ئەوا پیویستە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی فەرمانڕەوا بیت ))**

**لە پلانەکانی سەرکردەی دانا باشی یەکان وکەموکورتییەکان لەناویەکدا ئەتوێنەوە،(( پیویستەدەرفەتە دەست کەوتوەکان بقۆزینەوە ، وەخۆمان لەمەترسییەکان لابدەین ، بێ شڵەژان ودەرفەت لەدەستدان ))**

**بەلەر چاو گرتنی سەرچاوە لەبارەکان: پلانی جەنگی شیاوی جێبەجێ کردنە ،**

**بەلەرچاوگرتنی سەرچاوەنالەبارەکان : ئەوا سەختی ومەترسی وگەڕان بەدوای چارەسەر نامێنێ .**

**(( ئەگەر ویستم خاڵی لاوازی دوژمن بقۆزمەوە ، پێویستە کاردانەوەی تۆڵە سەندنەوەی دوژمن بۆ ئەمە هەژمار بکەم ، پاشان باشی وکەم وکوڕیەکانی بەگشتی لەبەرچاو بگرم )) بە مجۆرە سەرکەوتوو ئەبین لەبەدیهێنانی بەشی بنچینەیی پلانی گشتیمان.**

**لەلایەکی ترەوە ئەگەر ئێمە –بۆ بڕینەوەی کێشەکانمان –ئامادەبین هەردەرفەتێك بقۆزینەوە کەبۆمان هەڵئەکەوێ ئەوا ئەتوانین خۆمان لەوتەنگژەیە دەربهێنین .**

**بۆ کەم کردنەوەی ژمارەی دوژمن ، وێرانیان بکەو توشی زۆر کێشەیان بکە . وایان لێبکە هەمیشە خەریکی چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانیان بن . باشترین لەخشتە بردنیان پێشکەش بکە ، وایان لێبکە دەربچن وبەدوایدا ڕابکەن . ( شیا لن ) ڕوونی دەکاتەوە :-وێران کردن تەنها مەبەستی زیانی جەستەیی نی یە ، لەخشتە بردنی زۆر بدە بەچاکترین وداناترین پیاوی دوژمن ، تاکو بێ ڕاوێژکار بمێنن .شار پڕ بکە لەو ناپاکانەی کەدژی سیستەمی حوکمڕانیەکەین ، پیلان وفێڵ ڕێك بخە، لەنێوان**

فەرمانڕەواو وەزیرەکانی گومان بچێنە ، گشت فێڵێکی زیرەك بەکاربهێنە ، ببە هۆی لەناوچوون وبەفیڕۆدانی سامانی گەل وگە نجینەکانی .وەڕەوشتی تێك بدە بەهۆی دیاری فێلاَویەوە . کەبیبات بەرەو تەماحکاری وچڵێسی وداواکردنی زیاتر وە بە پێشکەش کردنی ژنێکی شۆخ خەیاڵی نارەحەت بکە بە وئاسودەی مەکە، لەخشتەی بەرە وای لێ بکە سەربازەکانی دەربکات بۆ شوێنێك زیانی زۆری پێ بگەیەنیت ،((مانۆڕی گەورەی سەربازی زۆر داهاتی دەوڵەت ئەچۆڕێنێ ،گە نجینە گشتییەکەی شەکەت بکە،داهات وسەرچاوەداراییەکانی لەناوببە . گیانی دوبەرەکی لەناو ڕیزەکانی بچێنە ، ڕێگامەدە لەناوخۆدا یەکگرتووبێت ،

پێنج هەڵەی مەترسیدار هەیە کاردەکاتە سەر سەرکردە:-

١- کەلەڕەقی وهەڵەشەیی – ئەبێتە هۆی لەناوچوون ((ئازایەتیەك بێ بیرکردنەوە ، وەکو گای هار))لەم جۆرە دوژمنە بەهێز بەرامبەری مەگرە، بەڵکو لەخشتەی بەرە بۆ بۆسەو پاشان بیکوژە)) ئازایەتی بەتەنها بەس نیە بۆ سەرکەوتن بەڵکو پێویستی بەعەقڵ وتەگبیر وبیرلێکردنەوەو ڕەچاوکردنی ئە نجامەکانە))

٢- ئەو ترسنۆکیەی ئە تخاتە دیلێتی((وازهێنان لەدەرفەتی هەڵکەوتوو، هەلاَتن لەڕوبەڕوبونەوەی مەترسی-جەخت کردنەوە لەگەڕانەوە بەزیندویەتی –ئامادەنەبوون بۆ گیانبازی))

٣-خێرا توڕەبوون((ئەکرێ بەئاسانی بوروژێنرێت بە گاڵتە پێکردن)) .

٤-هەستیاری لەڕادەبەدەر لەئاستی ناوبانگ وئابڕوو ، کەدەبێتە هۆی ترسێکی زۆر لەشورەیی وئابڕوچوون . ((نابێ والەم بڕگەیە تێبگەین کەزەمکردنی پرەنسیپەکانی ئابڕووە، بەڵکولێرەدا زەمکردن ئاراستەی هەستیاری لەڕادەبەرە ،هەرکەسێ پارێزگاری لە ئابڕووی خۆی بکات هێندە بایەخ بەشتەکانی تر نادات . ئەتوانین بەئاسانی لەو شوێنەی دابنێیت کەخۆت دەتەوێت)) .

٥- ڕاڕایی زۆر لەسەرژیانی سەربازەکان وحەزنەکردن کەژیانیان بخرێتە مەترسی یەوە. ((جارێکی ترمەبەست لێی گوێ نەدان نیە بەژیانی سەربازەکان ، بەڵکو مەبەست لێی ترسە لەبەخشینی قوربانی سەربازی بۆئەوەی ژیانی سەربازەکان پارێزراو بێت ، سیاسەتێکی کورت بینانەیە .چونکە بۆ ماوەیەکی زۆر ئەم سەربازانە لەشکستدا دەبن . ((بەدیل گیران ، کوشتن))یان لەباشترین دۆخدا درێژکرنەوەی ماوەی شەڕە . هەست کردن بە پەژارە بۆ سەربازەکان هانی سەرکردە ئەدا بۆ پابەند نەبوون بەڕێساکان وهەڵەکردنی سەربازی)) .

ئەمە پێنج هەڵەی فریودەرە بۆ سەرکردەی سەربازی، کەکاریگەری وێرانکەری هەیە لەشێوازی بەڕێوە بردنی جەنگ . لەکاتی بەزینی سوپاو کوژرانی سەرکردەکەی ، بەدڵنیاییەوە لەم پێنج هەڵەیە بەدەر نیە، وابکە ئەم پێنج هەڵەیە شوێنی بیرکردنەوەو تێڕامان وتەگبیرکردنت بێت .

# وەرزی نۆیەم

## هونەری جولاندنی سەربازەکان

بەشێوەیەکی گشتی یەك لەبنچینەکانی جەنگ و مانۆڕ ئەوەیە کەسوپاکان زەوی بەرز و خۆرەتاو بەباشتر بزانن . ئەگەر سوپایەك هەستا بەدانانی سەربازگە لەزەویەکی بەرزونزیك لەئاو وسەوزایی و لەگەڵ بوونی ئازوخەی تەواو . ئەوا خۆیان لەنەخۆشی دەپارێزن، بە مجۆرە سەرکەوتن تۆمار ئەکا . وەکاتێ نزیك ئەبنەوە لەگرد وسەنگەر وکەناری ڕوباری بەر خۆرەتاو ئەوا سوپا سوود وەردەگرێت لەم خەسڵەتانە وداهاتی بەدەست هاتووی ئەم خاکە . وەکاتێ باران بەلێزمە دەبارێ وئاوی ڕوبارەکە بەرز ئەبێتەوە لێی مە پەڕەوە تا کو کەم ئەبێتەوە . وەئەگەر قوڕاوی ڕامالراو و بیر ودرز و تۆر وتەڵەت بینی دەبێ بەرەو دوور بکشێیت و لێیان نزیك نەبیتەوە . وەکاتی لێیان دوورئەکەویتەوە دوژمن ڕابکێشە ئەوێ .

لەکۆندا ئەوەی یەکە مجار جەنگاوەرە زیرەکەکان ئەیانکرد ، مانەوەیان بوو لـــەدۆخی زاڵ نەبوون .چاوەڕوان بوون هەر درزێك لەڕیزەکانی دوژمنەوە دەربکەوێت . دۆخی زاڵ نەبوون پشت بەجەنگاوەر خۆی دەبەستێت ، بەلام کەوتنی دوژمن لەدرزەکانی خودی دوژمندایە .

جەنگاوەرە زیرەکەکان پارێزگاری ئەودۆخی زاڵ نەبوونەیان دەکرد ، بەڵام نەیاندەتوانی دوژمن بکەنە ئاما نجێکی ئاسان .

بۆیە دەتوانین بڵێین مرۆڤ دەزانێت چۆن سەرکەوتن بەدەست بێنێت بەلام ناتوانێت .

دۆخی زاڵ نەبوون یان نەبەزین لەشێوازی بەرگری کردندایە . توانای سەرکەوتن وا لەهێرشدا .

بەرگری لەخۆت بکە ئەگەرهێزی دوژمن لەتۆ زیاتر بوو . هێرشی بکەسەر ئەگەر ئەوهێزی کەمتر بوو .

پێزیستە جولاندنی سەربازەکان هاوتای هونەری خەڵەتاندنی جەنگی بێت ، ئەگەر هێزەکەمان دەهێندەی هێزی دوژمن بوو ئەوا دەبێ دەوری بدەین وگەمارۆی بدەین . وەئەگەر هێزەکە پێنج هێندەی دوژمن بوو ، ئەوا دەبێ هێرشی بکەینە سەر ، وە ئەگەر هێزەکە دوو هێندەی دوژمن بوو ئاگری بۆ تێبگرە ، وەلەکاتێکدا هەردوو هێز یەکسان بوون ئەوا دەبێت بتوانیت هێزەکەی دوژمن دابەش بکەی ولەیەکی هەڵوەشێنیتەوە ، وەئەگەر هێزەکەت کەمتر بوو لەهێزی دوژمن، پێویستە بتوانیت بەرگری لەخۆت بکەیت ، وەئەگەر بارودۆخ لەبارنەبوو لەگشت لایەنێکەوە ، ئەوا هیچ چارەیەکت نی یە تەنها پێچە بەدەورەکردنی(( مراوغە )) دوژمن نەبێت . لە پێش جولاندنی سوپا بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی دوژمن ، هەر دەبێ پشکنینێکی ورد بکەیت ، شاخەکان ببڕەو ، لەنزیك دۆڵەکان بمێنەوە و سەربازگە لەبەرزییەك دابنێ ، وەکە دوژمن لەشوێنێکی بەرز مایەوە سەرەو ژوور هێرش مەکە . لەدوای پەڕینەوە لەڕوبار لێی دوورەوەکەوە ، لەکەناری دەریا هێرش مەکە سەر دوژمن ، لێی گەڕێ با هەتا نیوەی بپەڕێتەوە . لەدەشتی تەختی هێرشی بکەسەر. شوێنێ داگیربکە کارت ئاسان بکات . شاخەکان بخە پشتت و

لای ڕاستت ، وە دواوەت پارێزراو بێت . کاتێ ئەبینی چۆلەکەکان لەدەغلێکدا هەڵدەفڕن ، ئەوا دوژمن بۆسەت بۆ دادەنێ . وەکاتێ تەپ وتۆز لەناکاو بەئەستونی بەرزدەبێتەوە ، ئەوا عەرەبانەکانی دوژمن بەڕێوەن ، بەلاّم هەرکاتێ تەپ وتۆز بەنزمی وچڕی وبە پانی بەرز دەبێتەوە، ئەوا پیادەی دوژمن نزیك دەبێتەوە . ئوتزو وادەبینێت کە دوژمن گفت وگۆدەکات زۆر بە لەخۆبوردەیی ولەکاتێکدا چاودێری ئامادەکاریەکان دەکات ئەوا هێرشدەکات ، وەکاتێ ڕێپێدراوەکانی بەفێڵ و گاڵتە پێکرنەوە گفت گۆدەکەن کەچی یەکەکانیان پێشڕەوی دەکەن بەشێوەی نمایش ئەوا خەریکی کشانەوەن .

# وەرزی دەیەم

## زەوی

ئەتوانین بە پێی سروشتی زەوی پۆلێن بکەین بە ئاسان ، مەترسیداری بێسوود، تەسك ، سەخت وبەرین . وەدەبێ سەرکردە بەوردی زانیاری هەبێ لە سەری و پلانی گونجاو دابنێت بۆ ئەو سروشتە ، کەهاوڕێکی زەوی لەکەڵ پلانی سەربازی زۆر پێویستە .

خۆت بناسەو دوژمن بناسە ئەمە واتا سەرکەوتن مسۆگەرە.

زەوی بناسەو کەش وهەوا بناسە واتە سەرکەوتن گشتگیرە.

ئەتوانین زەوی دابەش بکەین بۆ شەش جۆر:-

١- زەوی ئاسان (( ڕێگاکانی تەخت وڕێگای گەیاندنی زۆرە ))

٢-زەوی مەترسیدار(( ئەگەر چویتە ناوی ئەکەویتە تەڵەوە کەبەئاسانی بۆت دائەنرێت ))

٣- زەوی ڕێگر (( ئەو زەویانەی دوات ئەخەن وئەوەیشی بە شوێنتا بێت دوا ئەکەوێ ))

٤- ڕێڕەوە تەسکەکان ،

٥- بەرزاییە ترسناکەکان .

٦-ئەو ناوچانەی زۆر لەدوژمنەوە دوورە.

(( ڕەنگە دۆخی ئێستامان لەگەڵ ئەم دابەش کرنەدا نەگونجێت ،بەڵام هەر شێوازی بیرکرنەوەی سەربازی چینی کۆنمان بۆ باس دەکات ))

بەڵام ئەو زەویانەی کەهەردوولا ئەتوانین پێیدا تێپەڕین پێی دەڵێن زەوی ئاسان بەدەستهاتوو. ئەو زەویانەی سروشتیان وایە دەبێ پێش دوژمن داگیری بکەین . بەتایبەتی شوێنی بەرز وخۆرەتاو (( کەئاستی بینینی زۆرە )) جەخت لە پاراستنی هێڵی دابین کرنت بکەوە.ئەوکاتە ئەتوانیت شەڕ بکەیت وچاکترینەکانت لابێت (( نهێنی سەرکەوتن لەجەنگدا والەتوندی هێڵەکانی دابین کردن و پەیوەندیەکان – ناپلیۆن پۆناپارت بۆ نمونە ))

ئەو زەویانەی کەدەتوانین لێی بکشێینەوە، بەڵام زەحمەتە جارێکی تر بتوانین داگیری بکەینەوە. پێی دەڵێن مەترسیدارە. لە هەڵوێستێکی ئاوادا ئەگەر دوژمن لە ئامادەییدانەبوو ئەتوانی بەهێرشێکی ناکاوی غافڵگیری بکەیت و بیبەزێنی . بەڵام ئەگەر لەئامادەییدابوو بۆ هاتنت و شکستت هێنا لەوەی بیبەزێنی ومەحاڵە گەڕانەوەت ، ئەوا کارەسات ڕووت تێدەکات . ئەگەر زەویەکە لەیەکەم هەنگاونان بۆ هەردوولا مەحاڵ بوو زاڵ بن بەسەریدا، ئەمە پێی دەڵێن ڕێگر (( هەردوولا ئەزانن یەکەم هەنگاونان لەبەرژەوەندی نی یە ، هەردوولا لەدۆخی بەستویی دەمێننەوە کۆتایی دێت بەکەوتنە ناو تەنگژەیەکی گەورەوە ))

لەهەڵوێستێکی ئاوادا تەنانەت ئەگەر دوژمن تامێکی سەرنج ڕاکێشی بۆدانایین ، (( بە پشت تێکردنمان وخۆی وا پیشان بدا کەئەکشێتەوە ،نەمانخەڵەتێنێ بەوازهێنانمان لەشوێنەکەی ئێستامان )) چاکترین شت ئەوەیە هێزەکانمان بڵاوە پێنەکەین

(( بەڵکو بکشێینەوە بەشێوەیەك دوژمن پێمان بخەڵەتێت. هەرکە جوڵەی بەبەشێك لەسوپاکەی کرد و دەرچوو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەمان )) ئەوکاتە ئەتوانین هێرشی بکەینە سەر ئەمە چاکترینە بۆ ئێمە . سەبارەت بەڕێڕەو تەسکەکان ،ئەگەر سەرەتا توانیت داگیری بکەیت ئەوا دەست بکە بەسەنگەرسازی باش وچاوەڕوانی هاتنی دوژمن بکە ، (( بەمەش دەست پێشخەری لە دەستی ئێمەدا دەبێت، کەلەرێگەی جوڵەی غافلگیری وناکاوی دوژمن ئەخەینە ژێر بەزەیی خۆمان )) .

سەرەڕای ئەوەی دوژمن توانای هەبوو پلانەکانت تێك بدا بۆ داگیر کردنی ڕێڕەوێکی تەسك ، بەلاّم ئەگەر سەنگەرسازی باشی کردبوو لەتەنگەبەرێکدا دوای مەکەوە، بەلاّم ئەگەر سەنگەر سازی لاوازبوو دوای بکەوە.

سەبارەت بە بەرزاییە مەترسیدارەکان ،ئەگەر پێش دوژمن کەوتبوویت ، دەبێ ناوچە بەرز وخۆرەتاوەکان داگیر بکەیت .لێی بمێنەوەوچاوەڕێی دوژمن بکە. (( باشی داگیرکردنی بەرزاییەکان لەوەدایە دوژمن زەحمەتە بزانێت پلانی چیت هەیە. بەمەش ناتوانێت خۆی بسە پێنێت بەسەرتدا )) .

(( مێژوو باسی ئەو سوپایانەمان بۆ دەکات کەسەربازگەیان لەدەشتاییەکان داناوە وبەرزاییەکانیان جێهێشتووە، باران وقوڕاو هاتووەوسەربازگەکەی دا پۆشیوە ، بۆیە بەرزاییەکان باشی زۆریان هەیە ))

ئەگەر دوژمن پێش تۆ بەرزاییەکانی داگیرکرد، دوای مەکەوە . بەلاّم بکشێوە و لەخشتەی بەرە بەدواتا دابەزێت. ئەگەر تۆ لەشوێنێك بوویت بەماوەیەکی زۆر لەدوژمن دوور بوو ، وەهێزی هەردوولا یەکسان بوو . ئەوە ئاسان نابێت تورەی بکەی بۆ دەست کردن بەشەڕ. بەڵکو شەڕکردن لەبەرژەمەندی ئێمە نی یە. (( نابێت بیر لە ڕۆیشتنی دوور ودرێژی پڕ ماندوویی بکەینەوە لەکاتێکدا دوژمن بەگشت هێزێکیەوە چاوەڕوا نمان بکات ))

ئەمە ئەو شەش پرەنسیپەیە کە پەیوەستە بەزەویەوە،ئەو سەرکردە سەربازیەی کەگەیشتوەتە ئاستی لێپرساوێتی دەبێت ئەم پرەنسیپانە بخوێنێتەوە:-

**شەش لەناوبەرەکەی سوپاکان**

سوپاکان توشی شەش جۆری لەناوبەر(( مەترسی )) ئەبن . کەبەهۆی هۆکاری سروشتەوە دروست نابن . بەڵکو هەڵەی سەرکردایەتی یە ، سەرکردەی سەربازی بەرپرسیارێتی یەکەی هەڵدەگرێت . ئەمانەن:-

١- هەڵچوون \داروخان\هەلاّتن .

٢-هەڵگەڕانەوەو یاخی بوون لەفەرمانەکان .

٣-داڕوخانی ناوەکی ولەدەستدانی ئازایەتی .

٤-وێران بوون.

٥-داڕوخانی ڕێکخستن .

٦- بەزینی نەخوازراو .

کاتێ کاریگەریەکان یەکسان وبێلایەن بن ، هێزێکی سەربازیمان خستە دژ هێزێکی سەربازی ترکەدەهێندەی ئەو یان زیاتر بەهێزتر بێت لەئە نجامدا دۆخێکی پڕ هەڵچوون پەیدا ئەبێت کەبۆ سوپای یەکەم هەژمارنەکرابوو. ئەگەر سەربازەکان

بەهێزبوون ، بەڵام ئەفسەرەکان لاواز بوون ، ئەوا ئە نجامەکەی هەر هەڵگەڕانەوەویاخی بوونی بەکۆمەڵی فەرمانەکان دەبێت لەنێوان سەربازەکان. بەلام بە پێچەوانەوە ی ئەمە دۆخێکی داڕوخانی ناوەکی ولەدەستدانی ئازایەتی ولاوازی گشتی پەیدا ئەبێت . (( ئەفسەرە بەهێزەکان دەیانەوێت پێشڕەوی بکەن و فشار ئەخەنەسەر سەربازە لاوازەکان ، سەربازەکانیش بەشێوەی کۆمەڵ دائەڕوخێن وئاژاوە دروست ئەبێت )) .

کاتێ ئەفسەرە پلە باڵاکان توڕە ئەبن ،وئەوانیش دەست ئەکەن بەیاخی بوون لەفەرمانەکان ،(( چاوەڕوانی فەرمانی هاتوو ناکەن و چۆنیان بوێت بە پێی بەرژەوەندی خۆیان ڕەفتار ئەکەن )) ئەیانبینی لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن بە پێی حەزی خۆیان(( لەهەست کردنیان بەبێزاری وتوڕەیی شەڕ ئەکەن لە پێش فەرمان کردن بەشەڕ لەلایەن سەرکردەی گشتی یەوە )) لەئە نجامیشدا بەدڵنیاییەوە توشی کاول بوون وڕوخان ئەبن .

لەکاتی لاوازی سەرکردەی گشتی وداماڵینی لەدەسەلاتەکانی بۆجێبەجێکردنی فەرمانەکانی ، وەکاتێ فـەرمانەکـــانی ڕوون و ئاشکرانین ، وەلەکاتی نەبوونی ئەرکی ئاسایی ڕوون ودیاری کراو پەیوەست بە ئەفسەرو سەربازەکان ، وەلـــەکاتی ڕێکخستنی پلە سەربازیەکان بەشێوەیەکی گەندەڵی وهەڕەمەکی ، لەئە نجامی ئەمانەدا دۆخێکی داڕوخان لەقەوارەی ڕێکخستنی سەربازی ڕووئەدات .

کاتێ سەرکردە ناتوانێت هێزی دوژمن هەڵسەنگێنێت ، ئەوا ڕێگەئەدا بەهێزی بچوك شەڕ لەگەڵ هێزێکی لەخۆی گەورەتر بکات . یان پاڵ بەدەستەیەکی لاوازەوە دەنێت بەخێرایی ڕووبەڕووی هێزێکی بەهێزببنەوە و دانانی باشترین سەربازەکانی لە ڕیزەکانی پێشەوە پشت گوێ ئەخات ، ئەمەش ئە نجامەکەی بەزینی خرا پە(( دانانی باشترین پیاوەکان لەڕیزەکانی پێشەوە ، وورەی سەربازەکان بەرز ئەکاتەوە وورەی سەربازەکانی دوژمن ئەهێنێتە خواری )).

ئەمە ئەو شەش دۆخەیە کەدەبێتە هۆی بەزینی مسۆگەر لەشەڕدا ، بۆیە پێویستە لەسەر ئەو سەرکردەیەی کەبەرپرسیارێتی سەرکردایەتی هەڵگرتووە بەباشی خوێندنەوەی بۆ ئەم دۆخانە هەبێت .

ڕێکخستنی ڕیك و پێکی دەوڵەت باشترین هاو پە یمانی سەربازە ،بەلام توانای باشی هەڵسەنگاندنی هێزی دوژمن وە زاڵ بوون بەسەر هۆکارەکانی سەرکەوتن و باش هەژمارکردنی سەختی وماندووبوون وبەربەستەکان ومەترسیەکان وماوەکان ، ئەمانە تواناکانی سەرکردە ئەخەنە ژێر ئەزموونەوە.

هەرکەسێك ئەم خاڵانە بزانێت ولەکاتی جەنگدا ئەم زانستانە بخاتە بواری جێبەجێکردنەوە لەگشت شەڕێکدا سەردەکەوێت وەکەسێك نەیزانێت یان نە یخاتە بواری جێبەجێ کردنەوە بەمسۆگەری توشی مەینەتیەکانی بەزین ئەبێت .

ئەگەر ئە نجامی شەڕ بەمسۆگەری سەرکەوتن بوو، ئەوکاتە پیویستە شەڕ بکەیت وتەنانەت ئەگەر فەرمانڕەوای گشتی ڕێگری لێت کرد،وەئەگەر شەڕ کردن سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا ئەوکاتە شەڕ نەکەی تەنانەت ئەگەر فەرمانڕەوای گشتییش فەرمانی بەوەدا.

ئەو سەرکردە سەربازیەی پێشڕەوی دەکات و مەبەستی ناوبانگ نی یە ، وەئەکشێتەوە بێ ئەوەی ترسی لەشورەیی و شەرمەزاری بێت بۆ ناوی خۆی ، کەیەك شت زاڵە بەسەر بیرکردنەوەیدا ئەویش پاراستنی وڵات وخزمەت کردنی پاشایە ، ئەوا ئەو سەرکردەیە گەوهەری تاجی دەوڵەتە .

تەماشای سەربازەكانت بكە هەروەك منداڵی خۆت بن ،   ئەو كاتە دوات ئەكەون بۆ ناو مەترسی یەكانی دۆڵە قوڵەكان ،تەماشایان بكەوەك ئەوەی خۆشەویستترین منداڵت بن ئەوا لەگەڵت ئەوەستن هەتا گیانیان ئەبەخشن ،((بیٚ بەهاترین جل لەبەر بكە كەئەوان لەبەری ئەكەن،   هەرزرانترین خۆراكێك  بخۆ كەئەوان دەستیان ئەكەوێت ،   وەكو ئەوان ڕیٚ بكە ، وەكو ئەوان سوار بە  وەكو ئەوان كۆڵ لەسەر پشتت هەڵگرە ))

ئەگەر تۆ – هەرچۆنێك بێت – چاك وسادەبیت ، بەلاٚم نەتتوانی سەربازەكانت والیٚ بكەی سنوری دەسەلاٚتت بەسەریاندا بزانن، ئەگەر تۆ دڵت باش بوو ،  ئەتوانی فەرمانەكانت بەهێز فەرز بكەی ،   نەتتوانی – لەسەرووی ئەمانەوە- دیمەنی ئاژاوە و پشێوی كپ بكەیتەوە ، ئەو كاتە سەربازەكانت وەك منداڵی بەنازیان لیٚ دێت ، هیچ كەڵك وسودێكیان نابێت . ((ئەگەر سەربازەكانت سڵیان لێت كرد ولێت ترسان ،ئەوا لەدوژمن ناترسن ))

ئەگەر زانیمان سەربازەكا نمان لەدۆخێكدان ڕێگادەدا بۆ هێرش كردن ، وەنەمانزانی كەدوژمن لەدۆخێكدایە كەڕێگای هێرش كرد نادا ، ئەوا ئەوكاتە ئێمە تەنها نیوەی ڕێگای سەركەوتنمان بڕیوە .

ئەگەر زانیمان دوژمن لەدۆخێكدایە ڕێگای هێرش كردن ئەدا ، وەنەمانزانی كەسەربازەكا نمان لەدۆخێكدان كەڕێگای هێرش كردن نادات ، ئەوا ئەوكاتە ئێمە تەنها نیوەی ڕێگای  سەركەوتنمان بڕیوە .

ئەگەر زانیمان دوژمن لە دۆخێكدایە كە ڕێگای هێرش دەدات و ، وەهەروەهایزانیمان كەسەربازەكا نمان لەدۆخێكدان كەڕێگای هێرش كردنیان ئەدات ، وەنەمانزانی كەبەرزو نزمی  زەوی شەڕەكە والیٚ دەكات بیٚ كەڵك بێت ، ئەوا ئەو كاتە هێشتا نیوەی ڕێگای سەركەوتنمان بڕیوە .

لەبەر ئەمە ، سەربازی كارامەی بەئەزمون ، هەركە كەوتە جوڵە كردن ، توشی شڵەژان ودڵە ڕاوكیٚ نابێت .هەركە نیشتەجیٚ بوو ، هیچ شتێك نادۆڕێنیٚ(( چونكە  پێش جوڵە كردن هەژماری  هەموو شتێك ئەكات ،باش ئەكۆڵێتەوە لەهۆكارەكانی سەركەوتن وادەكات لەبەرژەوەندی ئەودا بێت .بۆیە كاتیٚ دەجوڵێت هیچ هەڵەیەك ناكات .

بە مجۆرە وتەكە ڕاست دەرئەچیٚ:- ئەگەر دوژمنت ناسی و خۆت ناسی ، ئەوا سەركەوتن گوماناوی نابێت ، وەئەگەر سروشتی ئاسمان وزەوی شەڕت زانی، ئەوا سەركەوتنەكەت بەتەواوی  ئەبێت .

# وەرزی یازدەیەم

## نۆ گۆڕەپانەکەی شەڕ

**هونەری جەنگ نۆ جۆری زەوی دەناسێت:-**

**١- زەوی پەرش ((کە پەرش و بلاو ئە کاتەوە))**

**٢- زەوی ئاسان .**

**٣-ئەو زەویەی شایانی ئەوەیە زەحمەتی بکێشی لەبەدەست هێنانی .**

**٤-زەوی کراوە .**

**٥- زەوی ڕێگا یەکتر بڕەکان .**

**٦- زەوی مەترسی \سەغلەت.**

**٧- زەوی سەخت .**

**٨- زەوی دەوردراو .**

**٩- زەوی نائومێد بوو لێی \ لەناوبەر**

**کاتێ سەرکردە لەناوخاکی خۆی شەڕدەکات ، ئەوا لەسەر زەوی پەرش شەڕدەکات ((بۆیە وای پێدەڵێن چونکە سەربازەکان خاك و ماڵەکانیان لەنزیکی خۆیان دەزانن ،بەدڵنیاییەوە ئەوان لەدۆخی حەزی گەڕانەوەن بۆناو منداڵ و خێزانەکانیان. بۆیە لەکاتی شەڕدا کەدەرفەتیان دەست بکەوێت لەو ناوە بلاو ئەبنەوە و پەرش ئەبن لەگشت لایەکەوە هەڵدێن بۆ شوێنی خۆیان .**

**وەکاتێ سەرکردە بەماوەیەکی کەم دەچێتە ناو خاکی دوژمنەوە ئەوا لەسەر زەوی ئاسان ڕادەوەستێ((چونکە بەئاسانی دەتوانێ بکشێتەوە وبگەڕێتەوە بۆناو خاکی خۆی ))**

**ئەو زەویەی پێویستە دەستی بەسەردا بگیرێت وبەکەڵکە بۆ هەردوولای ململامێکار ئەوا ئەو زەویە شایانی زەحمەتی کێشانە کەدەستی بەسەردا بگیرێت ((ئەو زەویانەدەگرێتەوە کە کەمیینە ولاوازەکان دەتوانن بەرگری لێ بکەن بەڵکو سەرکەوتوش بن بەسەر بەهێزەکان وەکو ڕێڕەوە تەسکەکان ))**

**زەوی کراوە ئەوەیە کەهەردوولا بەئازادی تەواو ئەتوانن جوڵەی تێدابکەن ، تۆڕێکی ڕێگای پێکەوە بەستراو ویەکتر بڕ پشتیوانی دەکات .**

**ئەو زەویەی کلیلی گەیشتن بەسێ ولاتی تەنیشت پێکدێنێ ((زەوی خۆمان ،زەوی دوژمن ، زەوی ولاتی تەنیشت ))بەجۆرێك هەرکەسێ یەکە مجار بیگرێت ، ئەتوانێت ئیمپراتۆریەتێك بەتەواوەتی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە((ئەوکاتە دلسۆزی ئەوانی تر بەدەست دێنێ)). وەئەو زەویەی کەڕێگای زۆری گەیاندنی یەکتر بڕو بەرامبەر یەکی تێدایەئەوە زەوی ڕێگا یەکتر بڕەکانە.**

**کاتێ سوپا بەقولایی ئەچێتە ناو زەوی دوژمنەوە ،وەهەندێ شاری سەنگەرسازیکراو لە پشتی خۆیەوە بەجێدێڵێ کەئازاد**

نەكراون ، ئەوا ئەم زەویە مەترسیدارە. ((كاتێ سوپایەك ئەگاتە ئەم خاڵە ئەوا لەجێگایەكی مەترسیدارە)) .

دارستانەكان ولاپاڵە سەختەكان و زۆنگاوە قوڵەكان و تەنكەكان ، هەموو ئەو زەویانەی بەزەحمەتی وگرانی لێی تێپەڕ ئەبی ، پێی دەگوترێت زەوی سەخت.

ئەو زەویانەی ناتوانی بیگەیتێ تەنها لە ڕێگای دەروازەو تەنگەبەرەكان، ئەوەی كەناتوانیت لێی بكشێیتەوە تەنها لەڕێگای ڕێڕەوە نادڵنیاكان ، كەوا لەفەسیلێكی بچوكی دوژمن دەكات بتوانێت ژمارەیەكی زۆری هێزەكەمان تێك بشكێنێت ، بەم زەویە دەگوترێت زەوی دەورەدراو(( پڕمەترسی )) .

ئەو زەویەی كەدەتوانین لەفەوتان لێی ڕزگاربین – تەنها بەكوشتاری گەورەی پڕ لەئازایەتی بەبێ دواكەوتن پێی دەگوترێت زەوی نائومێد.((وەك ئەوەی پێشتر وایە تەنها ئەم ڕێگایەكی ڕونی ڕزگاربوونی نیە ، وەك حاڵی بەلەمێك كە نوقم دەبێت یان ماڵێك كەدەسوتێ )) .

بۆیە شەڕ مەكە لەزەویەكی پەرت ولە زەوی ئاسان مەوەستە وهێرش مەبە بۆسەر ئەو زەویەی شایانی ئەوەیە زەحمەتی بۆ بكێشی بۆ دەست بەسەرا گرتنی .

ئەگەر دوژمن دۆخێكی چاكتری دەست كەوت ، وەبوە خاوەن هەندێ باشی وناچاری كردین هێرشی نەكەینەسەر ، بەڵكو فریوی بدەین ((بەدروست كردنی هەلاتن ))بۆ دەرباز بوون بۆ زەویەك كەچاكی وباشێتی بۆئێمە تێدابێت .

هەوڵ مەدە ڕێگا بگری لەدوژمن لەسەر زەوی كراوە ، چونكە ئەمە بەسەرتا قڵپ ئەبێتەوە و هێزی هێرشبەر ئەخاتە دۆخێكی زۆر قورسەوە. وەلەسەر زەوی ڕێگا یەكتر بڕەكان لەگەڵ دراوسێكانت هاوپەیمانی ببەستە .

تالانی ودزی بكە بەخێراترین هێزت لەسەر زەوی مەترسیدار((ئەم ئامۆژگاریە دژە لەگەڵ پرەنسیپە ستراتیژیە زانراوەكان، كەنابێت ئازاری خەڵكی سەر زەوی دوژمن بدەیت، وەچاكە كردن لەگەڵیاندا بەمەستی بەدەست خستنیان لەڕیزەكانمان و نەبنە بزمارێك لە پشتتدا، ڕەنگە مەبەستی نەكردنی ئەمەبێ ونەك هاندان بۆ كردنی ، بەڵام نوسراوەی شیكەرەوەكان پێچەوانەی ڕای ئێمەیە ))

لەسەر زەوی دەورەدراو دەبێ فێڵ وخەڵەتاندنی تازە داهێنراو وگونجاوت هەبێت ، بۆ هەڵوێستەكە ئەوەی سەرلەدوژمن تێك ئەدا ، وەلەسەر زەوی نائومێد :- شەڕبكە چونكە كاتێ دەرفەتێك لەئاسۆدا نابینی بۆ هەلاتن ، شەڕكردن والەسەرباز ئەكات هەرچی هەیە ئەیبەخشێ بەئومێدی دەربازبوون بۆ سەركەوتن.

سەركردە دێرینە شارەزاو كارامەكان دەیانزانی چۆن مێخ داكوتن لەنێوان پێشەوەو پاشەوەی سوپای دوژمن ((بەتەواوی لێكیان جیائەكردەوە )) ڕێگریان ئەگرد لە پەیوەندی كردن و هاوكاری كردنی نێوان یەكە گەورەو بچوكەكانی سوپا، ڕێگریان دەكرد كەیەكە بەهێزەكانی دوژمن لاوازە توش بووەكان ڕزگاربكات . وەڕێگریان لەسەركردەكانی دوژمن ئەكرد كەهێزەكەی كۆ بكاتەوە بیهێنێتەوە بۆ شەڕكردن . كاتێ سەربازەكانی دوژمن یەكگرتوو بوون ، سەركردە دێرینەكان توانیویانە ئاژاوە لەنێوانیاندا بڵاوبكەنەوە كەنەتوانن كۆببنەوە .كاتێ ئەمە لەبەرژەوەندیان بووە ، سەركردە دێرینەكان فەرمانیان دەركردووە بە پێشڕەوی كردن . ئەگەر وانەبووبێت ، فەرمانیان دەركردووە بەڕاوەستانی چوونە پێش ، بەمەبەستی بڵاوكردنەوەی ئاژاوە لەنێوان دوژمن وەڕاوەستان كاتێ كە جموجۆڵ كردنەكە سوودێكی نەبێت . ئەگەر هێزەكەی دوژمن كۆبوەوە ، مەهێڵە خۆی ڕێك بخاتەوە .

ئەگەر لێم بپرسی چی بکەین لەگەڵ هێزێکی ژمارە زۆر وقەبارە گەورە کە ڕیز وهێڵەکانی ڕێکخراو بوو ؟ زۆر بەبەشی ئامادەبوو بۆ هاتنە سەرت .بە مجۆرە وەڵامت دەدەمەوە :دەست بگرە بەسەر شتێکی پڕ بایەخی دوژمن ، ئەو کاتە دوژمن ملکەچی ویستەکانت دەبێت.

خێرایی گەوهەری جەنگە . جەخت کەرەوە کە لەنائامادەیی دوژمن سوود وەرگریت . ڕێگای خۆت ببڕە بەبەکارهێنانی ئەو ڕێو شوێنانەی کە پێشبینی ناکرێت وهێرش بکەسەر ئەو خاڵانەی کە پاس نەکراوەن .

ئەمانەی خوارەوە ئەو سەرەتایانەن کەدەبێ ڕەچاو بکرێن لەلایەن هێزی هێرش بەرەوە ، هەتا هێزەکەت چوبێتە ناو قوڵایی سنوری دوژمنەوە ، سەربازەکانت زیاتر پەیوەست ئەبن وبە مجۆرە بەرگری کاران ناتوانن زەپەرت پێ بەرن .

وڵاتی بە پیت داگیر بکە لە پێناوی دابین کردنی خۆراکی سوپاکەت . بەوریایی لەهۆو هۆکارەکانی ئاسوودەیی سەربازەکانت بکۆڵەرەوە(( بەزەبیت هەبێ بۆیان . چارەسەریان بکە ، سادەبە لەگەڵیان ، خواردن وخواردنەوەیان بدەرێ باڵێیان زیاد بێت )) باجی زیاد مەخەرە سەریان ، وزەت چڕ بکەرەوە و هێزت کۆبکەرەوە، سوپاکەت هەمیشە بەیەکگرتوویی و جوڵاوە بهێڵەوە (( بەجۆرێك کەدوژمن شوێنی دیاری کراوت نەزانێت )) وە پلانی ئاڵۆر دابهێنە کەڕوون نەبێت (( لەلای دوژمن )) .

سەربازەکانت فڕێدە ناو ئەو هەڵوێستانەی کەهەلێ هەڵاتنی نیە .ئەو کاتە مردن بە چاکتر ئەزانن لەهەڵاتن . ئەگەر سەربازەکانت ڕووبەڕووی مردن بونەوە ، هیچ شتێك نیە نەتوانن بەدەستی بهێنن . ئەوکاتە ئەفسەر وسەربازەکانت پێکەوە هەموو وزەیەکیان ئەخەنە گەڕ .

سەربازەکان لەهەڵوێستە پڕ نائومێدیەکان هەستیان بەترس نامێنێ ، ئەگەر هیچ ڕێگایەکی هەڵاتن نەبێت ئەوا بەجێگیری ڕائەوستن . ئەگەر لەسەر زەوی دوژمن بوون ئەوا پێشەوەیان کەلەڕەق ئەبێت ، ئەگەر هیوا بڕاو بوون لە یارمەتیدان ، ئەوا بەڕەقی وتوندی شەڕ ئەکەن . بەمەش بێ فەرمان دەرکردن بۆیان ، سەربازەکان لەدۆخی بەخشین دەبن بەبێ داواکردن . ئەوەی دەتەوێت جێبەجێی دەکەن پێش ئەوەی داوایان لێ بکەیت . بەبێ قەید ومەرج وسنوور، لەدۆخی ئەوپەڕی بەخشیندا دەبن کە دەتوانی متمانەیان پێ بکەیت . مەهێڵە بیرکردنەوەی قوربانیکردنی خێر وڕەشبینی بڵاوبێتەوە ، هیچ گومان وبیری پڕوپوچی خەیاڵی مەهێڵە . وەهەتا مردن خۆی دێت ، پێویست بەترس ناکات لە هیچ ماوە یکی هێمنی .(( پڕوپوچ- خرافات —ترس ونائومێدی دێنێ ، پێش مردنی ڕاستی سەد جار پیاوان دەکوژێت ، پێویستە جادوو کردن وفاڵ گرتنەوە وئەستێرەی بەخت تەماشاکردن مەهێڵە ، ئەمە ترس ئەخاتە عەقڵیانەوە ))

ئەگەر سەربازەکانت بایەخیان نەدا بە دەستکەوتنی پارە وماڵ ، وامەزانە حەزیان لەدەوڵەمەندی نیە . وەئەگەر تەمەنیان درێژ نەبوو وامەزانە حەزیان لە ژیان نەبووە، (( سون تزو ئەیەوێت بڵێت سەربازەکان مرۆڤن ، حەزیان لەدەوڵەمەندی وتەمەن درێژی هەیە ، لەبەر ئەوە هیچ لەخشتە بردنێك مەخە سەر ڕێگایان کە ئەم حەزە سروشتی یەیان هان بدات واز لە شەڕ بهێنن و ڕوبکەنە دنیا ))

ئەو ڕۆژەی فەرمان دەرئەکەی بۆ سەربازەکان بۆ شەڕ ئەو کاتە سەربازەکان فرمێسك ئەڕێژن وبـــەڕومەتیانا دێتە خوار و جلەکانیان تەڕ ئەکات ،(( ئەمە لە ترسیانەوە نیە ،بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەوان پەیمانیان بەستوە کەفەرمانەکان جێبەجێ بکەن یان بمرن )) بەڵام لێیان گەڕێ پێ بخەنە زەوی گۆڕپانی جەنگەوە ، ئەبینی ئازایەتی ( شۆ یان کیو ) پیشان ئەدەن

((شۆ))ی پاڵەوان لەسەردەمی –سون تزو- بووداوایان لێکرد فەرمانڕەوا-وانج لی ئاو- بکوژێت بەخە نجەرێك کەشاردبوویەوە لەنـــاو سکی ماسی یەك کە پێشکەشی کرد لـــەسەر مێزێك بـــــەلاَم هـــەرلە پاش ئەو کارەی پارچە پارچە کرا بەشمشێری پاسەوانەکانی پاشا . ئەو سەرکەوتوو بوو لەو کارەی لە پێناویدا چوو. پاڵەوانی دووەم پێش ناوبانگی یەکەم کەوت ، کـــە شانشینی – لو-سێ جار بەزێنرا لەلایەن شانشینی –چی –خەریك بوو خۆ بەدەستەوە بدات ، بەرامبەر دەست بەردار بوونی لە پارچەیەکی گەورەی خاکەکەی ،بەلاَم –کیو –ی پاڵەوان بەخە نجەرێك لەسەر سنگی – هوان کینج- وەستاکە شازادەی شانشینی – چی - بوو، داوای کرد پە یمانی خۆبـــــەدەستەوەدانی ڕاست بـــکاتەوە ،چونکە شانشینی – لو –بچوك ولاوازە ، شازادە کە پاسەوانەکانی نەیانتوانی نزیك ببنەوەلەترسی ژیانی ، ناچاربوو ڕازی بێت بەداواکاریەکەی – کیو- ئەو کاتەی کە –کیو –خە نجەرەکەی کێشایەوە و ڕۆیشت لەناوەڕاستی حەشامەتە ترساوەکە وەستا ،بێ ئەوی ڕەنگی بگۆڕێ یان چاو بتروکێنێ شازادە ویستی لەقسەکەی پەشیمان بێتەوە ، بەلاِم((کوان شۆنج ))ی ڕاوێژکاری پاشهاتەکانی گەڕانەوەی لەقسەکەی کەداویەتی بۆ ڕونکردەوە ، ئابە مجۆرە ئازایەتی –کیو- شانشینی پاراست لە لەدەستدانی ڕێژەیەکی زۆری زەویەکەی کەلە سێجار بەزیندا دۆڕاندبووی .

ئەتوانین تەکتیکی دانایانە بەماری(( شوان –جان ))بچوێنین ، کەلەچیاکانی شانج هەن. هەرکە لەلای سەری ئەم مارە بدەی بەکلکی هێرشت بۆ دەکات ،هەرکە لەکلکی بدەی بەسەری هێرشت بۆ دەکات . هەرکە لەناوەندی جەستەی بدەی ، ئەوا بەسەر وکلکی هێرش دەکاتە سەرت ، ((وشەی شوای جان واتە خێرایی کت و پڕ بەزمانی چینی ، ئەمە وەرگیراوە لەسڵ نەکردنەوەی ئەم مارە لەهێرشی کوشندە، کەئەمرۆ گەشەی کردوە وبووەتە وشەیەکی سەربازی هاوتا بەمانۆڕی جەنگی ))

ئەگەر بپرسی ئەکرێ سوپا لاسایی ماری شوای جان بکاتەوە ؟لەوەلاَم دەڵێم بەڵێ.(( پێشەوەو دواوەی سوپاکەت والێ بکەلە کاتی هێرش کردنە سەر یەکێکیان ، خێرا ئەوی تر وەلاَم بداتەوە ، هەروەکو دوو ئەندام بێت لەیەك جەستەدا . ))

ئەگەر پیاوانی –وو- ولەگەڵ پیاوانی –یو – زۆر دوژمنی یەك بوون ، پێکەوە لەیەك بەلەمدا پەڕینەوە وگەردەلولێکی توند هەڵیکردە سەریان ، ئەوا بەتەواوی هەوڵی یارمەتی یەکتر ئەدەن هەروەکو دەستی ڕاست یارمەتی دەستی چەپ ئەدا .

((واتە ئەگەر دوو دوژمن لەکاتی مەترسیەکی نزیك یارمەتی یەکتر بدەن ، ئەی چۆن دوو پارچەی سوپایەك یارمەتی یەکتر ئەدەن ؟ کەیەك بایەخی پێکەوە گرێدراو وبەرژەوەندی هاوبەش پێکیانەوە دەبەستێ. کەدەبێت ئەمە بە وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت. چەندین سوپا کەمی پەیوەندی نێوانیان تەفروتونای کردن . بەتاییەتی لەدۆخی سوپا هاوپە یمانیەکان)) بەستنەوەی ئەسپەکان تا ڕانەکەن ، یان چەقاندنی تایەی عەرەبانەکان لەقومدا تاسەربازەکان هەڵنەیەن . بەس نیە .

((ئەمانە ئامرازەکانی هەلاَتن بوون لە کاتی سون تزو ، ئـــــەمە مانای ئـــــەو هۆیانەیە کەتۆ وادەزانی ڕێگری لەهەلاَتنی سەربازەکان ئەکەی لەگۆڕەپانی شەڕ، بە پێی تێڕوانینی سون تزو ئەوەی بەڕاستی ڕێگری هەلاَتنی سەربازەکان ئەکات ، یەکگرتوویی ویەك ئاما نجییانە. ))

بنەمای ئەو پرەنسیپەی کەبەڕێوە بردن وڕێکخستنی کاروباری سوپای پێ دەکرێت ، بریتیە لەدانانی پێوانەیەکی ئازایەتی کەدەبێت هەمووان پێی بگەن .

(( دەبێت سەربازەکان یەك دڵیان هەبێت ،یان بەلای کەمەوە لەئاستێکی لەیەك نزیکی ئازایەتی بن ))

چۆن زۆرترین سود لەبەهێز ولاواز دەبینی ئەم پرسیارە بەکارهێنانی دروست وباشتری زەوی دەگرێتەوە . (( دەبێ سود لەبەهێز ولاواز وەربگری بەیەکەوە، لەڕێگای ئەوەی وایان لێ بکەی سود بەخش بن بەبەکارهێنانی خەسڵەت وباشی یە جیاوازەکانی زەوی ،بۆنمونە : هێزە لاوازەکان کە سەنگەرسازی باش کراون لە شوێنی قایم ، ئەتوانێت بۆئەو ماوەیە شەڕبکات کەهێزێکی بەهێز تیایدا ئەمێنێتەوە لەزەویەکی زۆرکراوە وکەم قایمکراو . ))

سەرکردەی زیرەك سەرکردایەتی سوپاکەی دەکات ، وەك ئەوەی سەرکردایەتی یەك کەس بکات بەسوك وئاسانی . ئیشی سەرکردە ئەوەیە بەهێمنی بمێنێتەوە تا نهێنێتی مسۆگەر ئەکات . وەڕاست وداد پەروەر بێت ، ئەوا ئارامی سیستەمی گشتی مسۆگەر ئەکات .

پێویستە لەسەری ئەفسەر و سەربازەکانی سەرسام بکات ، (( چاو وگوێیان بخەڵەتێنێ ))لەڕێگای خۆپیشاندان وڕاپۆرتی فێڵاوی ، بە مجۆرە بێ ئاگایان دەکات . (( نابێت سەربازەکانت لە سەرەتاوە بەشداری پلانەکانت بن ، بەڵکو تەنها دەبێت بەئە نجامە ئەرێنی یەکانی پلانەکانت شادمان بن لەگەڵتدا . یـــەکەم پرەنسیپی جەنگی ئـــەوەیە دوژمن سەرلێ بشێوێنی وسەرسامی بکەیت ولەناکاو بۆی بچی ،بەلام ئەی چی دەربارەی سەرلێشێواندنی هێزەکەت وپیاوەکانت ؟ نهێنی تەواو و گشتگیر زۆرجار کلیلی سەرکەوتنە. تەنانەت لەگەڵ هێزەکانت ، ئەوکاتە ئەوان بەشێوەی سروشتی ڕەفتار ئەکەن ، ئەمەش زۆرتر سەر لەدوژمن ئەشێوێنێ کەچاودێریت دەکات ))

لەڕێگەی ڕێك کردنەوەی ئامادەکاریەکان وگۆڕینی پلانەکان (( پلانێك یەکجار زیاتر بەکارناهێنرێت )) سەرکردەی زانـــا دوژمنەکەی ئەهێڵێتەوە بەبێ متمانەیی لەمەبەستەکانی، بڕوای بەو زانیاریانە نابێت کەلەسەر ئەم دەستی کەوتووە. لەڕێگەی گواستنەوەی بارەگای سەربازەکان وبەگرتنەبەری ڕێگای پێچی ناڕاستەوخۆ ، ڕێگا لە دوژمن دەگرێتٚ کـــــەئـــاما نجی ئەم جموجۆڵانە پێشبینی بکات . (( شانج یوو لێدوانێکی پڕ بایەخی هەیە :- لەڕاستیدا جەنگ خەڵەتاندنە وتەنها لەسەر سنوری دوژمن ناوەستێ ، بەڵکو فراوان ئەبێت پیاوەکان وسەربازەکانی خۆتیش ئەگرێتەوە ))

لەچرکەساتی یەکلا کەرەوەدا- سەرکردە ڕەفتاری ئەو کەسە دەگرێتەبەر کەسەردەکەوێتە سەر لوتکەی چیایەکی بەرزو پاڵ بەو پەیژەیەوە دەنێت کە پێی سەرکەوتووە ، وپیاوەکانی ئەباتە زەوی دوژمنەوە بێ ئەوەی دەستی دەرکەوێ . واتە هەنگاوی چارەنوس ساز ئەنێت ، وادەکات مەحاڵ بێت سوپا بگەڕێتەوە . وەکو تاریقی کوڕی زیاد لەکاتی گرتنی ئەندەلوس ئەو کەشتیانەی سوتاند کەسەربازەکانی پێ گوازرابووەوە . کاتێ بەسەربازەکانی گووت :- دوژمن لە پێشتانەو دەریا لە پشتتانەوەیە کەشتیەکان ئەسوتێنێ، ومە نجەلەکانی چێشت ئەشکێنێ ، وەکو شوانێك مێگەلێك ئەباتەڕێوە ، ئاوا سەربازەکان لە پێش ئەدا . بێ ئەوەی کەسێکیان بزانێ بۆ کوێ ئەڕوات . گرد کرنەوی سەربازەکان و پاڵنانیان بەرەو مەترسی – ئەمە ئیشی سەرکردەیە-(( مەبەستی سون تزو ئەوەیە کە پاش تەواو بوونی جموجۆڵ ومانۆڕ و دیداری دوژمن لێرەدا نابێ دوا بکەوین – یان ڕاڕا بین -لەتێگرتنی تیرەکا نمان بەرەو دڵی دوژمن ))

پێوەرە جیاوازە گونجاوەکانی ئەو نۆ دۆخەی زەوی ئەمانەن :-مەودای گونجاوی تەکتیکەکانی هێرش کردن یان بەرگری کردن، یاسا بنچینەییەکانی سروشتی مرۆڤایەتی ، ئەمانە ئەو شتانەن کەدەبێ بەوردی خوێندنەوەی بۆ بکرێت .

لەکاتی داگیرکردنی زەوی دوژمن پرەنسیپی گشتی ئەوەیە کە چوونە ناو قولایی ولاتی دوژمن ، یەکگرتویی و پەیوەست بوون دەهێنێ بۆ سوپاکەت ، بەلام چوونە ناو دوورابیەکی کەم واتا پەرش وبلاوی و پەرتەوازە بوون . کەولاتت لە پشتتەوە بەجێ ئەهێلی وسوپاکەت زەوی بەرامبەر ئەبرێت و لەولاتی خۆت دائەبرێیت ، ئەوا تۆ لەسەر زەوی ڕاڕا دای ( حرجە )، (( پێویستە لەسەرت پێویستیەکانی خۆت بەخێرایی جێبەجێ بکەیت ، و بەڕێگای خۆتدا بڕۆی . کەئەمەش کەمجار ڕووئەدات )) لەکاتی دابین کردنی هێلی گەیاندن لەهەرچوارلاوە ، ئەوا زەوی دەبێتەزەویەکی ڕێگاگشتی یە یەکتر بڕەکان . کەدەچیتە ناو قولایی ولاتێکەوە دەبێت بە زەویەکی ترسناک ،وەکاتێ دەچیتە ناوەوە بە پانتاییەکی کورت ئەوا زەویەکی ملکەچی ئاسانە ،

کاتێ قەلاکانی دوژمن لە پشتتەوەیە ورێڕەوەتەنگەبەرەکان لە پێشتەوە ، ئەوا زەوی جێبەجێ ئەبێ بەسەرتا ،

لەکاتی نەبوونی پەناگای ئارام و حەشارگە ئەوا تۆ لەسەر زەوی نائومێدی وەستاوی ، لەبەر ئەوە لەکاتی وەستان لەسەر زەوی نائومێد هیمەت بە پیاوانم ئەکەم هیوایان پێ ئەبەخشم بەیەکێتی ئامانج .(( ئاکارێکی بەرگری پەیڕەو بکە وخۆت لەشەڕ لابدە ))

لەکاتی وەستان لەسەر زەوی ملکەچی ئاسان ،ئەو کاتە دلنیا ئەبم لەدابین بوونی پەیوەندی نزیك لەنێوان گشت یەکەکانی سوپاکەم وە لەسەر زەوی پێکەوە لکاو دواوەی سوپاکەم خێرائەکەم (( درێژە مەدە بەماوەی نێوان دواوە و پێشەوە – تاوەکو هەردووك پێکەوە ئەگەن بەئامانجی داواکراو لەیەك کاتدا ، بەلام بەجۆرێك دژی ئەو پرەنسیپە نەبێ ،کەنابێت لەدۆخی ماندوێتی لەجموجۆل ومانۆڕەکانمان بگەینە زەوی شەڕ)) .

لەسەر زەوی کراوە بەچاوێکی کراوەوە ئاگاداری هێزی بەرگریم دەبم . وەلەسەر زەوی کەڕێگای گشتی یەکتربڕی هەیە . هاوپەیمانێتیم بەهێز ئەکەم .

لەسەر زەوی ترسناك ، کارئەکەم بۆ بەدیهێنانی هێلەکانی دابین کردنی بەردەوام (( بەڕاسپاردەی ڕاڤەکاران :-بەتالانی ودزین وکۆکردنەوەی خۆراك ، نەك – هەروەك زۆریکتان وای ئەبینن- بەهۆی هێلەکانی پەیوەندی نەپساوەوە لەگەل بنکە بنچینەییەکانمان ))

وەلەسەر زەوی سەخت ، بەردەوام ئەبم لەخێرا ڕۆیشتن لەسەر ڕێگا .

لەسەر زەوی پەیڕەو کراو ، گشت ئەو ڕێگایـــانە ئەگرم کەگومانی هەلآتنی لیَ هەیە ، (( شیکاری ئەمە ڕەنگە بۆ پاراستنی شوێنی ئێستامان بێت ،بەلاّم مەبەستی ڕاستی ودروستیمان ئەوەیە وەکو بروسکە بدەینە سەر هێلّەکانی دوژمن ودایبڕین ودەرچەیەك بکەینەوە کەلێوەی بچینە دەشتی سەلامەت )) .

لەسەر زەوی نائومێد بەسەربازەکانم ڕادەگەیەنم کەهیوایەك نی یە بۆ دەرباز کردنی گیانیان (( بیرەکانتان پڕ بکەرەوە، مە نجەڵەکانت بشکێنە ، کەل و پەلەکانت بسوتێنە ،وائەکەم کەڕوون بێت لەبەرچاوی سەربازەکان کە شەڕکردن تەنها ڕێگایە بۆ دەربازبوون .

(( سەرنجێك لەوەرگێڕانە ئینگلیزیەکەوە:- ئاشکرایە دەقە ڕەسەنەکە کەسون تزو خۆی نوسیویەتی نەگەیشتوەتە دەستمان ، بەڵکو هەندێك بەشی بزر بووە ، وەعەییداربووە کەڕێك نەخراوە بەو جۆرەی سون تزو ویستویەتی ، سەرنجی ئەمەش ئەدەین لەدرێژ بوونەوەی ئەم وەرزە و کورت بوونی بیَ پاساوی وەرزی هەشتەم . هاوئاواز نەبوونی ناونیشانەکە لەگەلْ ناواخنەکەی ولەدووبارەبوونەوەی قسەکردن لەسەر نۆ دۆخەکە. پاشان باس کردنی هەندێکی نەك گشتی ودووبارە باس کردنەوەی لە وەرزی یازدەیەم . بۆیە دەبیَ ئەمانە گشتی لەبەرچاو بگرین لەکاتی خوێندنەوەو تێبینی کردنی هەندیَ خالْ لەگەلْ هەندێکی تر دژ بەیەکن ))

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەسروشتی سەرباز دەرخستنی ئەو پەڕی توانای بەرگری یە لەکاتی گەمارۆدانی وەبەئازایەتی شێری برینداز شەڕ ئەکات ، کاتیَ نەتوانێت یارمەتی خۆی بدات وەکوێرانە گوێڕایەلْ دەبیَ کاتیَ مەترسی توش ئەبێت .

ئێمە ناتوانین بچینە ناو هاوپەیمانێتی میرە دراوسێکانمان هەتاکو باش لە پلان وئامانجەکانیان تێنەگەین . وەئێمە ئامادەنیمان سەرکردایەتی ڕێکردنی سوپایەك بکەین ئەگەر زانیاریمان نەبێت لەسەر ئەو زەویەی سوپاکە لەسەری دەڕوات . ، شاخەکانی ، دارستانەکانی ، مەترسیەکان ولا پاڵەکانی وزۆنگاو و دۆلْ وشیوەکانی . ناتوانین باشی یەکانی سروشتی لەبەرژەوەندی حۆمان بەکاربهێنین ئەگەر سود لە ڕیَ پیشاندەرە ناوخۆییەکان نەبینین . (( ئەم سیَ ڕستەیە دوبارەیە لەوەرزی حەوتەم و١٢- ١٤ لەگرنگیان بۆ پێکهێنانی دەروازەیەك بۆ ئەوەی دواتر کەدیَ ))

نەزانینی هەریەك لەم پرەنسیپانەی کەدیَ ناگونجێت لەگەلْ شازادەی جەنگ.

کاتیَ شازادەی جەنگ هێرش دەکاتە سەر شارێکی بەهێز ، تواناکانی سەرکردایەتی کردنی دەرئەکەوێت لەو شێوەیەی کە ڕێگری دەکات لەوەی دوژمن چاو بخاتە سەر هێزەکەی ، وە ئەو ترس ئەخاتە دلی دوژمنانیەوە وە ڕێگری دەکات لەوەی هاوپەیمانەکانی دوژمنەکەی بەشداری شەڕ بکەن لەدژی. .

(( پەرت کردنەوەی ڕیزەکانی دوژمن بالاّ دەستیت ئەداتیَ لە پالْ هێزەکەی خۆت . ئەو بالاّ دەستی یە دوژمن ئەترسێنێت. ئەم ترسە ناهێڵێت دراوسێکانی دوژمن بێنە یارمەتیدانی . ئەگەر دراوسێکانی ترسان ، ترس ئەخاتە دلی هاوپەیمالنەکانی وناهێڵێت بچنە پالْ دوژمن )) .

شازادەی جەنگ هەولْ نادات هاوپەیمانی ببەستێت لەگەل خەلکانی جیاواز یان هەر هەموویان ئەو هێزی شارەکانی تر زیاد

ناكات .شازادەی جەنگ هەلدەستێ بەجیبەجێ کردنی پلانەکانی لەگەڵ ترساندنی دوژمنەکەی ، بەمەش شازادە ئەتوانیت دەست بگریت بەسەر شارەکانی دوژمن وشانشینەکانیان وێران بکات .

پاداشت ببەخشە بێ ئەوەی بیژمێریت بەرێسا رێکخراوەکان ((بەبەخشندەیی پاداشتی ئازایەتی بدەو سزای ترسنۆکی وکشانەوە بدە ))فەرمان دەربکە بێ ئەوەی بیژمێریت بەسەسەر رێکارەکانی پێشووتردا((بۆ رێگری لەبلاْو بونەوەی نا پاکی ، پیویستە لەسەرت لە مجۆرە فەرمانانە دەربکەیت لەکاتی بینینی دوژمن . بەدڵفراوانی پاداشت بکە کاتێ نیشانەی ئازایەتی لەسەربازەکانت ئەبینی ))بەمەش ئەتوانیت مامەڵە لەگەڵ گشت سوپاکەت بکەی هەروەك مامەڵە لەگەڵ یەك سەرباز بکەیت . سەبازەکانت بەفەرمان ئاراستە بکە ، ومەهێڵە پلانەکانت بزانن . (( بڕیارەکانت بۆ سەربازەکان باس مەکە )) .

کاتێك ئە نجامە ئەرێنی یەکانی بڕیارەکانت روون ئەبێتەوە ، وابکە زۆر روونتر بێت لە پێش چاوی سەربازەکان . وەکاتێ ئەم ئە نجامە ئەرێنی یە دواکەوت ، هیچیان پێ مەڵێ .سوپاکەت ببە بۆ ناو مەترسی . خۆی لێی رزگار دەبێت . پاڵی بنێ بۆناو تەنگژەو هەڵوێستی سەختی نائومێد، خۆی بەسەلامەتی لێی دێتە دەر . چونکە بەدیاریکراوی کاتێك هێزێك لەرێگایەکی ترسناك ئەوەستێت ،ئەو ئەتوانێت سەرکەوتن بەدەست بهێنیت ((مەترسی ، کاریگەری بەهێزی هەیە لەدەرخستنی ئازایەتی پیاوان )) . سەرکەوتن لەجەنگدا بەدی دێت لەرێگای ئامادەبوونی تەواومان بۆ گونجاندنی بارودۆخمان بەووردی بە پێی مەبەستەکانی دوژمن . خۆت نیشان بدە بەگێلی وملکەچ بوون بۆ حەزەکانی دوژمن وبەدیهاتنیان .ئەگەر دوژمن حەزی خۆی دەرخست بۆ پێشڕەوی کردن ، چی لەخشتەی دەبا وهانی دەدات ئەوەی بۆ دەربخە ئەگەر دوژمن حەزی لەکشانەوەبوو خۆت دوا بخە وخۆت گێل بکە بەئەنقەست تاهانی دوژمن ئەدەی بکشێتەوە . مەبەستەکە لەکۆتایدا ئەوەیە دوژمن بخەیتە دۆخی تەمەڵی وخاوی تادەگاتە دۆخێکی خراپ پێش هێرشکردنە سەری .

لەرێگای سووربوونی بەردەوامامان لەسەر دەورگرتنی دوژمن ((رێ گرتنە بەری یەك ئاراستە)) ئەوا سەردەکەوین بۆ ماوەیەکی درێژ((هەزار یەکە بە پێوەری چینی )) ئەمە پێی دەڵێن توانای بەدەستهێنانی هەرشتێك بەلێهاتوویی وفێڵی تەواو . ئەو رۆژەی تۆ سەرکردایەتی دەگریتە دەست ((پاش بەزاندنی دوژمن وکوشتنی سەرکردەکەی )) ، هەستە بەداخستنی سەرجەم رێڕەوەکانی بەرەی شەڕ وخاڵەکانی هات وچۆ وێران بکە ((لەم رۆژەی ئێمەدا گوزەر نامە -جوازات )) هات وچۆی گشت نێردراوەکان بوەستێنە . ((بۆ دەرەوە وناوەوەی ولاْتی دوژمن ))لە ئە نجومەنی نوێنەران زۆر توند وتیژ بە ((زۆر پێداگری بکە تافەرمانڕەوا بڕیار ئەدات و ڕاستاندنی پلانەکانت ئەکات ))تا هەمیشە گەورەی هەڵوێستەکە بیت وبڕیار بەدەستی کاروبارەکان بیت . ئەگەر دوژمن دەرگایەکی کراوەی بەجێهێشت پێویستە خێرا پێیدا تێپەڕیت .شکست بە پلانەکانی دوژمن بهێنە بەدەست بەسەراگرتنی ئەوەی لەبەر چاو ئەو گران بەهاو بەنرخە . پاشان بەنەرمی وبەدکاری داگیرکاری بکە تاکو خۆت ئەچەسپێنی لەو کاتەی کەدوژمن تێیدا دەگاتە زەوی شەڕ . ئەگەر توانیت دەست بەسەر خاڵێکدا بگریت ، کەلەبەر چاوی دوژمنەوە گرنگە ، بەلاْم دوژمن پاش ئەوەی لەگۆڕەپانی شەڕ دەرنەکەوت تابیگەرێنێتەوە ، ئەوا ئەو چاکترینیەی کەدەستت کەوت بەشێوەیەکی کرداری سودت لێ نەبینیوە ، لەبەرئەوە ئەوەی دەیەوێت شوێنێکی پڕ بایەخ لەدوژمن داگیر بکات ، دەبێت کاتێکی لێزانانە و بەد رێك بخات بۆ دیداری دوژمن ، پاشان دەست بکات بە زمان لوسی ومەرایی کردن تاکو دوژمن لەوکاتەی

**دیاری کردووه ئاماده دەبێت .**

**(( ئەم ژوانە لەڕێگای سیخوڕەکانی دوژمنەوە دەری ئەبڕی . ئەوانەی کەدەگەڕێنەوە و ئەو زانیارییانە کەتۆ داوتە دەیگەیەنن ، بەمەش بەڕێگایەکی لێزانانە وفێڵاویانە نیازی خۆمان دەرئەخەین ، پێویستە پاش جوڵەی دوژمن ئێمەش بجوڵێین ، بەلاّم دەبێت پێش گەیشتنی دوژمن ئێمە بگەینە زەوی شەڕ ، ئەوجا ئەو خاڵە بەهاداره داگیر بکەین )) .**

**بەڕێگایەکدا برۆ کە بنکە دیاری کردوە ، وەهەستە بەگونجاندنی بارودۆخەکەت بە پێی دوژمن ، تابتوانیت بچیتە شەڕێکی چارەنوس سازی یەکلایی کەرەوە (( سەرکەوتن تاکە شتی گرنگە ، وەنایاتەدی بەڕێگای ئاسایی کە پەیڕەو دەکرێت . ناپلیۆن پۆنا پارت سەرنەدەکەوت لەشەڕەکانیدا مەگەر بەشکاندنی گشت ڕێسایەکی کۆنی جەنگی کەئەوانەی بەدەستی ئەم بەزێنران پێوەی پابەند بوون . ڕابێ لەگەڵ تەکتیکەکانی دوژمن تاکو دەرفەتت بۆ دەرەخسێت ، پاشان پێشڕەوی بکە و تێك هەڵپرژێ لەگەڵیدا لەشەڕێك کە چارەنوسی کوشتار دیاری دەکات .**

**لەسەرەتادا شەرمی کچە نەوجەوانێك پیشان بدە ، تاکو دوژمن لەڕیزەکانیدا دەرچەیەکت بۆ دەر ئەخات . پاش ئەوە پێشبڕکێی کەروێشکێکی کێوی بکە لەخێراییە زۆرەکەی ، کاتێ هێرش دەکەیتە سەر دوژمن ، ئەوا ئەو کات بۆ ئەو درەنگ دەبێت تاکو بەرگریت بکات و بەر هێرشەکەت بگرێت ..**

# وەرزی دوازدەیەم

## هێرش بە ئاگر

لەباری هێرش کردن بەئاگر دەبێ هەندێ بارودۆخی گونجاو وکەل و پەلی پێویست بۆ تەقەکردن دابین بکرێت ، ئەوانەی کەدەبێت لەبەر دەستدابن . هەندێ وەرزی گونجاو هەیە بۆ تەقەکردن ، وەهەندێ رۆژی تایبەت هەیە بۆ ئاگر کردنەوە . . باشترین وەرز بۆ تەقەکردن وەرزی وشکی نابارانـاوی یە ، وەباشترین رۆژ ئەوەیە کەبای نایات . وە رۆژە مانگی یەکان کە دەتوانی دیوارەکان وشتەکان ببینی لەبەر تریفەی مانگەشەو . بردنەوەی شەڕو داگیرکردنی ئاما نجەکان بەلام بێ سەرکەوتن لە دەستەبەرکردنی بردنەوە ئەوا ئاگادارکردنەوەی بەلایە وکات لەدەستدانە . لەبەر ئەمە دەڵێن فەرمانڕەوا زیرەکەکان پلانەکان تاوتوێ دەکەن وسەرکردە بەتواناکانیش جێبەجێی دەکەن بەوریاییەکی زۆرەوە .

ئەگەر هەرچی یەك دەکەی رێك دەکەوێ لەگەڵ بەرژەوەندی دەوڵەت ، بجوڵێ .

وەئەگەر هەرچی یەك دەکەی رێك نەبوو لەگەڵ بەرژەوەندی دەوڵەت ، مەجوڵێ .

پێنج رێگا هەیە بۆ هێرش کردن بەئاگر :-

١- سەربازەکانی دوژمن بسوتێنی لە سەربازگەکانیان .

٢- کۆگاکانی دوژمن بسوتێنی ((کۆگای ئازوخە وخۆراك وسوتەمەنی )) .

٣- هۆیەکانی گواستنەوەودابیکرنەکان بسوتێنی .

٤- چەك وجبەخانەی دوژمن بسوتێنی .

٥ - ئاگر تێبگری بۆ نێوان ڕیزەکانی دوژمن ((وەکو تۆپی گڕ وتیری ئاگراوی )) .

بۆئەوەی هێرش بکەین دەبێ رێگای گونجاومان بۆ ئەمە هەبێت ، پێویستە پێکهاتەو کەرەستە پێویستی یەکانی هێرش هەمیشە و بەردەوام لەئامادە باشیدابن . وەرزێکی گونجاو هەیە بۆ هێرش کردن بەئاگر وە ڕوژانی گونجاو هەیە بۆ ئاگرکردنەوەی فراوان . وەرزی گونجاو لەکاتی کەشی زۆر وشکە ، وەڕۆژی گونجاویش ئەوکاتەیە کەمانگەشەو کەوانە(( حەوتەم رۆژی مانگی هەیڤی یە )) یان چواردەیە ((رۆژی ١٤ ی مانگ وەرۆژانی ٢٧ و٢٨ ئەم چوار رۆژە بای چالاکی هەیە لەکاتی هێرش کردن بەئاگر ، پێویستە ئامادەکاری بکەین بۆ پێنج گەشەکردن کەڕەنگە ڕوبدەن :-

١- کاتێ گڕ لەناوجەرگەی سەربازگەی دوژمنەوە بۆ دەرەوە تەشەنەی کرد ، ئەوکاتە پێویستە یەکسەر لەدەرەوە هێرش بکەین

٢-ئەگەر گڕ تەشەنەی کرد بەلام سەربازەکانی دوژمن بێ دەنگ بوون ، وەخۆیان ڕاگرت ئەوا چاوەڕوانی هاتنی کاتی گونجاو بکە و هێرش مەکە . ((مەبەست لەهێرش کردن بەئاگر بلاوکردنەوەی هەراو هۆسەیە لەناو ڕیزەکانی دوژمن ، کەئەگەر دوژمن نەتۆقێت ئەوا واتە ئامادەیە بۆت وچاوەڕێتە ، پێویستە وریا بیت )) .

٣-كاتێ بڵێسەی ئاگر دەگاتە باڵاترین ئاستی ، ئەگەر کرا بەدوایدا هێرش بکە . ئەگەر نەکرا چاوەڕێ بە (( ئەگەر دەرفەتت دەست کەوت بیقۆزەوە و پێشڕەوی بکە ، وەئەگەر سەختی یەکان بەتین بوو لەشوێنی خۆت بمێنەوە )).

٤-ئەگەر دەرفەت ڕەخسا لەدەرەوەی سەربازگەی دوژمن هێرش بکەیت ، چاوەڕێ مەکە تاکو سەربازگەکە لەناوەوە ئەسوتێت ،بەلاّم کاتی گونجاو هەڵبژێرە بۆ هێرش کردن (( ڕەنگە لەناوەوەی سەربازگەی دوژمن هیچ شتێکی وای لێ نەبێت کەگڕی تیا بەربێت ، ئەوا چاوەڕوانیت بۆ گڕ گرتن درێژە ئەکێشێ )) .

٥-کەئاگرێ دەکەیتەوە لەو لایە بیکەرەوە کەبای لێوە دێت ، هێرش مەکە ڕووەو ئاراستەی با (( ئەگەر دوژمنت گەمارۆدا لەنێوان سوپاکەت و ئاگرە کراوەکەدا کەڕووەو ئەو گڕی گرتووە ، ئەوا ئازایانە دەکەوێتە شەڕەوە وهەر وەها تۆش لەو ئاگرە زیان ئەکەی .

ئەو بایەی لەڕۆژ هەڵ ئەکا بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام ئەبێ ، بەلاّم شنەبای شەوانە زوو هێور ئەبێتەوە .

لەگشت سوپایەك ، پێویستە ئەم پێنج گەشە کردنانە پەیوەست بەئاگر باش زانراو بن . پێویستە هەژماری جوڵەی ئەستێرەکان بکرێت . وەکاتەکان بەوردی لەهەژماری ڕۆژانە بزانرێت .((بۆ زانینی کاتی هەڵکردنی با ، هەروەها ئامادەباشی بۆ دوژمن کەئەگەر ئەویش چاوەڕوانی کاتی بای ئەکرد ))

کەواتە ئەوانەی کەئاگر بەکار دەهێنن کەیارمەتی یان بدات لەهێرش کردن ، زیرەکن .

وەئەوانەی ئاو بەکارئەهێنن کەیارمەتی یان بدات بۆ هێرش کردن هێزی زیاتریان دەست ئەکەوێ . لەڕێگای ئاوەوە ئەتوانرێت ڕێگری لەدوژمن بکرێت ، بەلاّم ناتوانرێت هەموو کەرەستەکانی لەناوببرێت . (( ئاو کاریگەری زۆرە ،بەلاّم ناگاتە کاریگەری ئاگری وێرانکەر . هەروەها ئاو ئەتوانێت ئاگر بکوژێنێتەوەو وشوێنەواری نەهێڵێت کەئەگەر سەربازگەی دوژمن لەنزیك سەرچاوەی ئاوەوە بێت ))

خەمباری چارەنوسیەتی — ئەو کەسەی بەبێ پێگەیاندنی گیانی سەرکێشی سەربازەکانی، ئەیەوێت سەرکەوێت لە شەڕو هێرشەکانی ،ئەنجامەکەیشی کات وتوانا بەفیڕۆدانە . (( پێویستە پاداشتی باشەکان بکرێت و دەستکەوتەکان دابەش بکرێت هەروەها پێویستە دەرفەتەکان کەدەڕەخسێت یەکسەر بقۆزرێتەوە )) .

فەرمانڕەوای هۆشیار، لە پێشدا پلانەکانی دادەنێت و سەرکردەی سەرکەوتووش چاودێری سەرچاوەکانی وسەربازەکانی دەکات ((لەڕێگای پاداشت وسزاو خەلاّت کردنەوە)) .

مەجوڵێ هەتا دەرفەتێك دەبینی دەیقۆزیتەوە ، هێزەکەت بەکار مەهێنە هاتا سودێکی لێ دەبینی . وەشەڕمەکە ئەگەر هەڵوێستەکەت شلۆق نەبێت . پێویست ناکات فەرمانڕەوا هێزەکەی بخاتە گۆڕەپان بەهۆی تورەبونێکەوە وە پێویست ناکات سەرکردە شەڕێك بکات بەهۆی سوکایەتی پێکردنێکەوە .

ئەگەر لەبەرژەوەندیتدایە ئەوا پێشرەوی بکە ، ئەگەر نا لەجێی خۆت بمێنە .

توڕە بوون بەتێپەڕ بوونی کات ئەگۆڕێت بۆ خۆشی ، وەهۆکاری  رك وکینە ڕەنگە بەسەریدا زاڵ بیت بە قایل بوون وڕازی بوونی دەروونی .    کەواتە فەرمانڕەوای هۆشیار ئـــــــاگادار ئەبێت وسەرکردەی گشتیش پڕ لە وریایی دەبێت ، ئەمەش ڕێگای مانەوەی دەوڵەتە لەدۆخی ئاشتی (( ناوخۆیی ودەرەکی )) لەگەڵ هێشتنەوەی تەواوی سوپاکەی بەسەلامەتی وبەئامادەباشی .

## وەرزی سیازدەیەم

## بەکارهێنانی سیخوڕ

هەروەکو گوتمان ولەبەر گرنگی یەکەی دووبارەی ئەکەینەوە . ئەگەر دوژمنەکەت ناسی وخۆتت ناسی ، پێویست ناکات لەسەد شەڕ بترسیت . ئەگەر خۆت ناسی و دوژمنەکەت نەناسی ،ئەوا تۆ تالیی بەزینت ئەچێژیت بەرامبەر هەر سەرکەوتنێکت ، وەئەگەر خۆت نەناسی ودوژمنت نەناسی ، ئەوا تۆ شێتی ولەگشت شەڕێکدا توشی بەزین ئەبیتەوە ، کۆکرنەوەی سەد هەزار پیاوی سەرباز ، وەرێ پێکردنیان بۆ ماوەیەکی زۆر بەمانۆڕی جەنگی ، بەدڵنیایی زیانێکی زۆر قورس ئەدا لەتاکەکانی گەل وداهاتی دەوڵەت ئەچۆڕێنێت . کەرادەی خەرج کردنی ڕۆژانەی حکومەت دەگاتە هەزاران ئۆنسە (( پارە ))لەزیو . وەهەراو بشێوی وئاژاوە لەناوە وەو دەرەوەی ولات بلاو دەبێتەوە . وەسەربازەکان لەماندوێتیدا ئــەکەون ، بـــــەهۆی ڕێکردنیان بۆ ماوەیەکــی دوورو درێژ ، وەنارەحەتیان زیاتر ئەبێت هەرکە ئەچنە ناو خاکی دوژمنەوە ، وەهەزاران خێزان لەکار ورۆزییان زیانیان پێدەگات .

سوپا شەرکەرەکان بەرەنگاری یەکتر ئەبن لەجەنگدا ، خوێن ڕێژیەکانیان چەندین ساڵ درێژە ئەکێشێت . هەرلایەکیان ململانێ دەکات بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتنی گەورە ، کەلەیەك ڕۆژێکدا دیاری ئەکرێت . دەبێ لەدۆخی دوژمن بەنەزانی بمێنیتەوە چونکە تۆ ڕەتی ئەکەیتەوە کــــەسەفتەیەك پارە یان هەندێك ئۆنسەی زیو خەرج بکەیت بۆ کڕینی کەس و مــوچەی چەندین سیخوڕ کە ئەوەش کارێکە لەلوتکە نامرۆڤایەتیدا . هەرکەسێك بە مجۆرە ڕەفتار بکات ئەوا سەرکردەیەکی لێهاتوو نی یە بۆ تاکەکان وەدەستی پارمەتی درێژناکات بۆ فەرمانڕەواکەی وسەرکەوتن بەدەست ناهێنێت .

بە مجۆرە – ئەوسەرچاوەیەی کەفەرمانڕەوای دانا وسەرکردەی زیرەك دیاری ئەکەن ، بۆ وەشاندنی گورزی توند و بەدیهێنانی سەرکەوتن کە پیاوانی ئاسایی ناتوانن بەدییهێنن ، ئەو سەرچاوەیەش زانیاری لە پێشینەیە لەکاروباری دوژمن . ئەم زانیاریە لــــە پێشینەیە بەدەست نایات لــــەرێگای فاڵ ونزا و پاڕانەوە لەخوا، یــان لەسەر ئەزمونی ساڵانە و پێشبینی یەلەبەرچاو گیراوەکان ، یان بەهۆی ئەستێرە وهەژماری ئاسمانی .

جموجۆڵ ونیازەکانی دوژمن ئەکرێ لەرێگای خەڵکانی ترەوە بزانرێت وبەس .

بە مجۆرە پیویستی بەکارهێنانی سیخوڕەکان دەرئەکەوێت ، کەدەکرێنە پێنج کۆمەڵەوە :-

١- خۆجێیەکان (( هاونیشتمانیان )) .

٢- ناوەکیەکان (( بۆناوەوەچوەکان )).

٣-جیابوەوەکان . (( دوانیەکان )).

٤-وێرانکەرەکان (( سەرلێشێوێنەکان )).

٥-ستراتیژیەکان (( زیندووماوەکان ))

کاتێ سەرجەم گروپە سیخوڕیەکان لەیەك کاتدا پێکەوە کار ئەکەن بە پەیوەستی یەکی تەواو ، ئەوکاتە هیچ کەس ناتوانێت

ئەم ڕێکخستنە نهێنی یە بدۆزێتەوە . ئەمەش پڕ بایەخترین هەواڵگرییە لەلای فەرمانڕەوا .

بەکارهێنانی سیخوڕی خۆجێیی ، واتە ئەوانەی دانیشتووی ناوچەکەن بەکاریان بخەیت (( تۆمۆ - ئەم خاڵە شی دەکاتەوە دەڵێ :- دانیشتوانی ناوچەکانی دوژمنت خۆش بوێت و وایان لێ بکە بێنە ڕیزی تۆوە و ببنە سیخوڕت )) .

بەکارهێنانی سیخوڕی ناوەکی واتە سود وەرگرتن لەئەفسەرانی سوپای دوژمن (( تۆمۆ دەڵێ :- پێویستە بەوریاییەوە نزیک بینەوە لەئەفسەر وسەربازە وەڕسەکان ، ئەوانەی وەلانراون لە پلە بەرزکردنەوە یان چلێسن و- تەماحکارن- لەبارودۆخی گشتی خۆیان ناڕازین یان هەڵگەڕاوەن وسزادراون .یان سەرکردەی سوپایی پەراوێز خراون کەدەیانەوێت ڕیزەکانیان شکست پێ بهێنن تاکو بیسەلمێنن کە لەو ڕایانەی کەهەیەتی لەسەر هەقە )) .

بەکارهێنانی سیخوڕە جوداخوازەکان واتە زاڵ بوون بەسەر سیخوڕەکانی دوژمن وە وایان لێ بکەیت لەبەرژەوەندی تۆ کاربکەن .(( هێشتا لەگەڵ تۆمۆ داین کەبەردەوامەو دەڵێت :- جودا خوازەکان کارئەکەن بە پێدانی زانیاری نادروست بەدوژمن ، بەمەش ناوەستێت کەئەو تاکانە بکەیتە سیخوڕی خۆمان ، کەئەکرێ ئەو سیخوڕانەی دوژمن بشارینەوە لای خۆمان ونەهێڵین کەبزانن ئێمە ئاگاداری ئەوانین . بەرامبەر ئەمە زانیاری لەو جۆرەیان پێ بدەین کەخۆمان ئەمانەوێت تاکو لای خۆیانەوە بیگوازنەوە بۆ دوژمن ، بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن )) .

بەکارهێنانی سیخوڕی سەرلێشێوێنەر و وێرانکەر ، جگە لە هەندێك کار کەبەرۆژی ڕوناك دەیکەین ، بەمەبەستی خەڵەتاندن هیچی تر ناکەن . بۆ ئەوەی سیخوڕەکانی دوژمن بیانناسن و دوژمنیان لێ ئاگاداربکەنەوە و زانیاری ساختەیان پێ بدەن ، تەنانەت ئەگەر پێیان زانرا ودەستگیر کران ولەژێر فشاری ئازاردانی دوژمن دانیان نا بەکارەکانیان ، ئەوا ئەو زانیارییانەی کەگووتوویانە سەرلێشێوێنەو ڕاستەقینە نییە.

سیخوڕە زیندووماوەکان ئەوانەن کەبەزیندوێتی دەگەڕێنەوە و هەواڵیان پێیە لەسەر سەربازگەی دوژمن ،

هیچ ئیشێك لەناو سوپا ناگاتە گرنگی پاراستنی پەیوەندی نزیك وقوڵ لەگەڵ سیخوڕەکان . هەروەها نابێت هیچ شتێك لەسەرووی پاداشتەکانی ئەم سیخوڕانەوە بێت بەبەخشندەیی . نابێت هیچ شتێك لەسەرووی نهێنی تەواوی مامەڵەکردن بێت لەگەڵ ئەم سیخوڕانە . پێویستە سیخوڕ بەئاسانی بگاتە سەرکردە وهەرکاتێ بیەوێت . سیخوڕەکان (بەگوێرەی سروشتیان ) هەمیشە لەگەڵ کەسێك کارئەکەن کەزیاتریان بداتێ . بۆیە نابێت هیچ شتێ زیاتر بزانن وەدەبێت هەمیشە وریایان بین ، کە ڕەنگە دوولایی بن یان جوداخواز بن .

نابێت سیخوڕ بەکاربخرێت بەبێ پرەنسیپی گشتی ڕوون وئاشکرا و پڕ دانایی . پێویستە سەرکردە گشت ڕاستی یەکان بزانێت ، ڕاست لەگەڵ درۆ بزانێت ، پاك وفێڵاوی بناسێت . ناتوانین کاروباری سیخوڕەکان بەسەرکەوتوویی بەڕێوەببەین بەبێ دەرخستنی نیاز پاکی و، تەواو ڕوونی وئاشکرایی و ڕاست گۆیی تەواو لەمامەڵەکردن . پێویستە متمانەی سیخوڕ بەدەست بهێنی بەبێ بەکارهێنانی عەقڵ وبیرکردنەوە لەڕا پۆرتە زانیاریە هاتووەکانی سیخوڕەکان . کەس ناتوانێت بەتەواوی متمانە بە ڕاستی ئەو زانیاریە هەواڵگریانە بکات .

زۆر وردبین بە ، لێهاتووبە ،سیخوڕەکان لەگشت جۆرە کاروبارێك بەکاربهێنە ،ئەگەر زانیاری نهێنیت دزەی کـــرد بۆلای هەر سیخوڕێك پێش هاتنی کاتی گونجاوی ئەو بابەتە، ئەو سیخوڕە بکوژە ، هەموو ئـــەوانەیش بکوژە کەئەم زانیاریەیان بۆی

گواستوەتەوە .کوشتنی ئە مجۆرە سیخوڕە بەرەڵایە سزایەکە بۆ ئەو ، وەکوشتنی دزە پێکەری زانیاریەکەش ئەوە نەهێشتنی ئەو دزە پێکردنانەیە .

هەرچی یەك بێت ئاما نجەکەمان گەر بەزاندنی دوژمن بێت یان گرتنی شارێك بێت یان کوشتنی کەسێك بێت ، پێویستە دەست بکەین بەزانینی لیستی گشت ناوەکان ، یارمەتی دەرەکان وئیشکەرەکان و پاسەوانەکان ، پێویستەسیخوڕەکان ئاراستە بکەین تاکو دڵنیا یی بدەن لەڕاستی ئەم ناوانە . پێویستە بگەڕێین کام لەم کەسانە بەبەرتیلی پارە شەیدا ئەکرێن .

پێویستە بگەڕیین بەدوای ئەو سیخوڕانەی دوژمن کەهاتوون لە پێناوی سیخوڕی کردن بەسەرمانەوە . دەتوانین لەخشتەیان بەرین بەبەرتیل ودووریان بخەینەوە لەشوێنی دووروخۆش نیشتەجێیان بکەین . بەمەش جیا ئەبنەوە وئەبنە سیخوڕی ئێمەو ئامادە ئەبن بۆ خزمەت کرد نمان .

لەڕێگای ئەو زانیاریانەی کەسیخوڕە جوداخوازەکان پێمان ئەدەن ئەتوانین سیخوڕی خۆجێیی وناوەکیمان دەست بکەوێت وکاریان پێ بکەین . هەربە زانیاریەکان دەتوانین زانیاری ساختە بدەینە سیخوڕە وێرانکەرەکان (( سەرلێ شێوێنەکان )) بیگەیەننە دوژمن.

لەکۆتاییدا بەهۆی ئەم زانیاریانەی کەگروپی جیاوازی سیخوڕەکان پێمان ئەگەیەنن ، ئەتوانرێت گروپێ سیخوڕی ستراتیژی بۆ ئەرکی دیاری کراو بەکار بهێنین .

ویست ومەبەست لەسیخوڕی کردن بەهەر پێنج شێوەکەی پێشەوە تەنها زانینی کاروباری دوژمنە . ئەو زانیاریانەی کەدەستمان ئەکەوێت سەرەتا لەسیخوڕی جوداوە یە ، بۆیە دەبێت زۆر بەبەخشندەیی ومیهرەبانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین .

نمونە بۆ ئەمە مێژووی کۆن پێمان ئەڵێت :- ئەستێرەی بنەماڵەی – ین –گەشایەوە بەهۆی (( ئای چی ))کەخزمەتی لەسایەی (( هیسا ))وەکرد هەروەها سەرخستنی بنەماڵەی ( چۆ ) بەهۆی – لویا- وەبوو کەلەسایەی(( ین )) خزمەتی کرد .

فەرمانڕەوای هۆشیار وسەرکردەی زانا ئەوانەن باشترین زانیاری هەواڵگری سەربازی بەکارئەهێنن بەمەبەستی سیخوڕی کردن وبەمەش ئە نجامی زۆر باش بەدەست ئەهێنن .

سیخوڕەکان سەرچاوەی هەرە گرنگن ، چونکە توانای سوپا لـــەبینینی دوژمن ولێ تێگەیشتنی وپاشان خۆ ئاما.دە کردن بۆی پشت بەوان ئەبەستێت . هەرچەندە زیاد ڕەوی لە پشت بەستن بەسیخوڕ ئەبێتە هۆی کاریگەری نەرێنی ، بۆیە دەبێت هاوسەنگی بکەین لەنێوان گشت سەرچاوە هەواڵگری وزانیاریەکان .

سیخوڕەکانی نیشتمان، ئەوانە ڕۆڵەی نیشتمانی دوژمن ئەکەنە سەربازی سیخوڕی بۆیە دەبێت سەرکردایەتی باڵا بەزانیاری تەواو خۆی تەیار بکات بۆ ئـەرکی هەرپێنج گروپە سیخوڕەکان . ئەبێ بزانێت کە پشت دەبەستێت بەسیخوڕی سەربازکراو بۆیە پێویستە بـــەڕادەیەکی زۆر ی میهرەبانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت . بـۆیە لێرەوە سەرکردایەتی باڵای هۆشیار وسەرکردەی بـەتوانا ئـەوان ئەتوانن زیرەکترین کەس بخەنە گـەڕ وەکو سیخوڕ وئـە نجامی بـا ش بـەدەست بهێنن . ئۆپەراسیۆنی سیخوڕی یەکێکە لە پێویستی یەکانی جەنگ کەسوپا لەجموجۆڵەکانی خۆی پشتی پێ دەبەستێت



**وەرگێڕلەچەند دێڕێکدا**

**ناو : ڕەشید ئەحمەدسابیر**

**لەساڵی ١٩٦٣ لەگەڕەکی شۆرجەی شاری کەرکوك لەدایك بووە ، قۆناغەکانی خوێندنی هەرلەوێ تەواو کردووە .**

**لەساڵی ١٩٨٢ شاری بەجێهێشتووەو پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە کردووە.**

**لەساڵی ٢٠٠٤ بەشداری خولی پێگەیاندنی ئەفسەرانی کردووە لەفێرگەی جەنگی بەکرەجۆ**

**خاوەنی چەندین وتارو نوسینە لەڕۆژنامە ی کوردستانی نوێ و گۆڤاری ڕێبەری پێشمەرگە**

**دیوانێکی شیعری هەیە لەژێر ناونیشانی(( مانگە شەو ویادگاری ))**

